

١٢

# سەدەیەك تەمەنی نوورین

## مامۆستا عەبدولکەریمی مودەڕڕیس

## بە پێنووسی خۆی بناسە


ئامادەکردنی

عەبدولدائیم مەعروف هەورامانی

بەناوی خوای گەورەو میهرەبان

**ناوی كتێب:** سەدەیەك تەمەنی نوورین، مامۆستا عەبدولكەریمی مودەڕڕیس بە پێنووسی خۆی بناسە

**نووسینی:** عەبدولدائیم مەعروف هەورامانی

**ژمارەی سپاردن:** ( 269 ) ساڵی 2007

**شوێنی چاپ:** كۆمپانیای چاپو پەخشی نووسەر / 07703612141

**نۆرەی چاپ:** یەكەم

**ساڵی چاپ:** 2007

**لە بڵاوكراوەكانی:** پرۆژەی (تیشك)، زنجیرە ( 12 )

**ناونیشانی پرۆژە لەسەر تۆڕی ئینتەرنێت:** **www.tishkbooks.com**

**ئیمەیلی پرۆژە:** **tishkbooks@yahoo.com**
**info@tishkbooks.com**

**نامەی محەمەدی مەلا کەریم سەبارەت بە چاپکردنی ئەم دەستووسە**

برای ئازیزو خۆشەویستم کاک (عبدالدائمی
هەورامانی) م ئاسی کە خەڵکی گوندی (نارنجەڵە)ی
لای (بیارە) یەو قوتابیی ماجستێرەو، نامەکەی
لە بارەی تەفسیرەکانی باوکی رەحمەتیمان (مەلا
عبدالکریمی مدرس) ەوەیە.

کاک عبدالدائم داوای رەزامەندیی لەوە
لێ کردم (لە خۆم و لە براو خوشکەکانم) بەوپێیە
کە هەموو مافە شەرعییەکانی موڵکییەتی باوکم بۆ
ئێمە گەڕاوەتەوە، کە لە بارەی تەفسیرەکانی
باوکمەوە ئەنووسێ و، کۆمەڵێک وتاریشی لەبارەی
باوکمەوە لە ڕۆژنامەو گۆڤارەکاندا بلاو کردووەتەوەو
ئەیەوێ لە شێوەی کتێبێکدا لە چاپیان بدا.

سەبارەت بە نووسینی نامەی ماجستێرەکەی
لەسەر تەفسیرەکان، دیارە کە باوکم هەر کتێبێکی
لە چاپ دا، بەو لە چاپدانە مافی ئەوەی بە خەڵک
داوە کە چۆنی بە باش ئەزانن مامەڵەیان لەگەڵ بکەن

-١-

تەنها بە جۆرێ نەبێ، کە بە هەر جۆرێ بووە، زیانی
بە بادکم و بە کتێبەکەی بگەیەنێ. کەواتە لەم
چوارچێوەدا بۆی هەیە بیانکا بە بابەتی لەسەر
نووسینی نامەی ماجستێرەکەی.
وتارەکانیشی دیارە وتاری مووڵکی خۆمنی و
چۆنی ئەوێ ئەتوانێ بەو جۆرە مامەڵەیان لەگەڵ بکا.
ئێمەیشی هەر ئەوەمان بۆ هەیە ئەگەر، خوا نەکردە
ناشایانی لەبارەی بادکمەوە تیایاندا نووسیبێ،
ئێمە داوای مافی خۆمانی لێ بکەین. ئەم مەرجە
دیارە تەفسیرەکانیش ئەگرێتەوە
بۆیە بەناوی خۆم و برا و خوشکەکانمەوە،
هەر لە ئێستاوە، سوپاسی گەرمی ئەکەم لەسەر
ئەم دوو کارەی کە ئەیانکا و، پیرۆزبایی
هەردوو بەرهەمەکەی لێ ئەکەم و، داوای ئەوەم
لە خواوەندی گەورە هەیە لەم کارانەی و لە
هەموو کارێکی خێردا سەرکەوتووی کا.

سلێمانی - محمدی عبدالکریم

٢٠٠٧/٢/١٤

# پێشەكی

**الحمد لله والصلاة والسلام على رسول الله**

زۆر غەمم بوو كە گەنجی موسڵمان مامۆستا عەبدولكەریمی مودەڕڕیس نەناسێ، پەرتوكی نەخوێنێتەوە، لە فەلسەفەی تێنەگات، لەبەر تۆزێ قەوزە لە گەوهەری ئەم دەریایە بێبەش بێ، كە هیچ زانایەك نییە بێ هەڵە بێ، هیچ پەرتوكێك نییە بێ پەڵە بێ، تەنهاو تەنها قورئان نەبێ.

وەلێ لە فەزڵی خواوە هەست بە جۆرە گۆڕانێك لە گەنجی موسڵماندا دەكرێ، هەست بە وەرچەرخانێكی هزری دەكرێ، بیرفراوانییەك بەدی دەكرێ، خۆ بەخاوەن زانین و كەڵك وەرگرتن لە كەسایەتییە گەورەكان ئەتروكێتەوەو غەمی غەمباران دەرەوێنێتەوە.

ئێمە هەمووومان یەكین، مەلایەك، شێخێك، سۆفییەك، گروپیەكی ئیسلامیی، گەنجێكی مزگەوت، نووسەرێك، شاعیرێك، ڕۆشنبیرێك..، بە مەرجی پاكییەتی و ڕاستی لەگەڵ خوادا..

مامۆستا مەلا عەبدولكەریمی مودەڕڕیس، هێمای مەلایەكی مێژەر پاك، چرا بۆ كتێبخانەی كوردی، مۆم بۆ ڕێبوارانی ڕێگەی تەسەوفی ڕاستەقینە، ڕەمز بۆ توانەوەو ماندوونەبوون لە پێناو داگیرسانی ڕووناكی.. دوای وەفاتی ڕاگەیاندنی لایەنەكان بە حكومەتیشەوە كردیان بەژێر لێوەوەو هێندەی گۆرانی بێژێك حورمەتی تازیەی ئەم پیرە ماندووە كوردەیان نەگرت.

ئیتر نازانم لەبەر ئەوەبوو كوردەو ئەوانیش هەر ئەوەندە ڕێزی زانایەك دەزانن كە كورد بێ!! یان لەبەر مێژەرەی پاك و سپی و ناوی مەلایە بە مامۆستای مودەڕڕیسەوەو ئەوانیش پێی قەڵسن!! یان حزبایەتی گەورەیی و خزمەت و پاكی لەبیر بردۆتەوەو شتی تری خستووەتە بریان!! كورتی و پوختی دەمەوێ بۆ مێژوو بنووسم، كە دەوڵەتێك هەبوو ڕێزی زانایانی خۆی نەدەزانی..

بە هەرحاڵ پرۆژەی تیشك ئەم جارە تیشكیان خستە سەر ئەم گەورە پیاوەو بۆ زیاتر تێگەیاندنی نەوەی نوێ لە ژیان و بەسەرهاتی ئەم كەڵە زانایەو وشیاركردنەوەی موسڵمان و ڕۆشنبیركردنیان بە داستانی ئەو قارەمانەی زۆر سوچی كتێبخانەی كوردی پڕ كردەوە و چەندین زاناو شاعیری ئەم گەلەی لە نێو تەپوتۆزی لەبیرچوونەوە دەرهێناو لەسەر سەكۆی زانست بە كوردو غەیرەكوردیشی ناساند، چەندین مامۆستای مێژەر پاكی پێگەیاندو مزگەوتی ئەم وڵاتەی كردە چراخان و لە كوردستانی ئەم دیوو ئەو دیوودا نووری زانستی داگیرساند.

لە لایەكی تریشەوە ئەم كارە مەزنەی تیشك و هەر كارو خزمەتێك كە كراوەو دەكرێ لە پێناو بەرز ڕاگرتنی نرخی ئەم زانا بێنازە، خزمەتێكە بەو هەمووە خزمەتەی مامۆستای مودەڕڕیس و وەفاو یادەوەرییە كە بۆ ئەو ڕۆحە پاكەی هەتا هەتایە بە پاكی دەمێنێتەوە بۆ ئەو قەڵەمە بڕشتەی جارێ نوكی دەگێراندە شیعرە بەرزەكانی نالی و مەحوی و مەولەوی و.. جارێ لە خزمەت تەفسیری قورئاندا دەگریاو جارێ شیعری دەهۆنییەوەو بەهارو گوڵزاری دەلاواندەوەو بە نامەیەك هۆشیاری دەدایە گەل و بۆ نەفامی گەل هۆن هۆن فرمێسكی دەباراند..

(ڕۆژگاری ژیانم) كە دەستنوسێكی مامۆستای مودەڕڕیسەو وردو درشتی ژیانی خۆی تێدا نووسیوەو تا ساڵی (1969)و هەندێ جار لە ژیانەكەی خۆی دەردەچێ و باس و خواسی زۆر شوێن و كەسایەتی و نامەكانیان دێنێتە نێو باسەكەو لەسەر هەندێكیان زۆر دەوەستێ و غەمی دڵی ناسكی دورە وڵاتی دەرەوێنێتەوە.

لە پێش وەفاتی مامۆستای مودەڕڕیسدا دەستم دایە كورت كردنەوەو لابردنی ئەوەی پەیوەست نییە بە خودی ژیانەكەوەو دەمویست كە تەواوم كرد بیبەمە حزوری مامۆستاو لە دوای (1969) هەر بەو چەشنە تەواوی كەم.

لەم كاتەدا لە ستافی ڕۆژنامەی (كۆمەڵ)ەوە تەلەفۆنیان بۆ كردم و هەواڵی كۆچی دوایی مامۆستایان دامێ و داوای

بابەتێکیان لێکردم، منیش بەو شیرزیی‌و تازیەبارییەوەو بە چاوی ئەسریناوییەوە ئەو شەوە بابەتێکم نووسی‌و بۆم بردن‌و ذیوە دەستنوسەکەشم هەر برد، بابەتەکەی خۆم کە بەناونیشانی (سەدەیەك توانەوە بۆ داگیرساندنی مۆمێك . ژیاننامەی گەورە زانای کورد ماموستا مەلا عەبدولکەریمی مودەڕڕیس) لە ژمارە (188)و (189)دا بلاوکرایەوەو زۆریش هانیاندام بۆ تەواوکردنی دەستنووسەکەو منیش دەستم لیێ جولاندو بە کۆمەکی خوا تەواوم کردو لە گۆڤاری ستاندەر لە ژێر ناونیشانی (پاش زیاتر لە سەدەیەك لە تەمەنی نورین، ماموستای مودەڕڕیس بە پێنووسی خۆی بناسە) لە ژمارە (1–10) بلاوکرایەوە.

پرۆژەی تیشکیش بە چاکی زانی لە دوو توێی کتێبێکدا بە چاپی بگەیەنێت‌و برام ماموستا ئارام عەلی سەعید پێشنیاری بۆ کردم ئەوەی کۆمەلّ بێنمەوە گۆڕێ، خۆیشم بە چاکم زانی‌و بۆ دووبارەنەبوونەوەی بابەتەکە هەندێ لەوەی زیاتر ماموستا ئاشنا بە خوێنەر دەکاو لە کۆمەلّ بلاوم کردووەتەوە بێنمەوە گۆڕێ‌و ئالوگۆڕێکی تێدا بکەم‌و هەندێ بابەتی ماستەرنامەکەش تەرجەمەی کوردی بکەم و پلانی کتێبەکە بەم چەشنە بێت:

- نازناوەکانی ماموستای مودەڕڕیس.
- سیفاتەکانی.
- کاردانەوەی زانایان لەسەری.
- وەسف‌و ثەنای زانایان لەسەری.
- ئەو پلەو وەزیفانەی بینیویەتی.
- ماموستاو قوتابیانی.
- نووسراوەکانی.
- ناساندنی ڕۆژگاری ژیانم.
- ماموستای مودەڕڕیس بە پێنووسی خۆی بناسە.
- کۆتا ژیانی مودەڕڕیس‌و کۆچی دوایی (1969 . 2005).
- جوانترین وەفا.
- پێڕست.

لە کۆتایی ئەم پێشەکییەدا دەمەوێ سوپاسی ڕۆژنامەی کۆمەلّ‌و گۆڤاری ستاندەرو پرۆژەی تیشك بکەم‌و خوا پایەداریان بکات، ئەزیزانم گەر هەلّەو پەلّەیەکتان بینی لەم کتێبە لێم ببورن‌و خوا لە منو لە ئێوەو لە ماموستای مودەڕڕیسیش خۆش بێ‌و هەرهەمووماں بە بەهەشتی بەرین شاد بکات.

وصلی الله علی سیدنا محمد وعلی آله وصحبه وسلم.

11/محرم/1427ك
2007/1/30م
گوندی وێنە

## نازناوەكانی مامۆستای مودەڕڕیس

مامۆستای مودەڕڕیس نازناوێكی زۆری هەیەو لە هەموویان دیارتر (مودەڕڕیس)ە، كە بەمانای (وانە بێژ) دێت، ئەمەش لەبەر ئەوەیە كە (25) ساڵ لە بیارەدا وانەی وتووەتەوە[1]. خۆیشی هێما بەم نازناوە دەدات‌و لە كۆتایی كتێبی (فوائد الفوائح)دا دەفەرموێ: "فقیر مؤلف عبدالكریم فرزند محمد مشهور بـ مدرس)[2].

یەكێكی تر لە لەنازناوەكانی بریتییە لە (نامی) كە ئەمەش نازناوی شیعرییەتی‌و لە شیعرە كوردی‌و فارسییەكانیدا بەكاری دێنێت، بەڵام لە شیعرە عەرەبییەكانیدا بەكاری ناهێنێ، هەربۆیە لە نێوەندی عێراقدا بەم نازناوە نەناسراوە.

هەر بەم نازناوەوە سێ پەرتووكی بەچاپگەیاندووە كە برتین لە:

1. بەدیع‌و عەرزوی نامی.
2. تەفسیری نامی.
3. خولاصەی تەفسیری نامی.

هەروەها ووشەی نامی لە كۆتایی زۆرێك لە شیعرەكانیدا بەدیدەكەی وەك:

(نامی) ئەناڵی لە دەرگای ڕەحمەت
بۆ عەفوی خۆی‌و ماباقی ئوممەت[3]

یان:

(نامی) بۆ مەولای ساداتی كیرام
دیاری ئەنێرێ بە بەستەی سەلام[4]

یان:

(نامی) ئەم نامە ئەنووسێت بۆتان
واتە خادیم بن بۆ خودای خۆتان[5]

لەگەڵ ئەم دوو نازناوەدا مامۆستای مودەڕڕیس ناوەكەی پاڵ دەدرێتە پەنای هەندێ شوێن، وەك:

. مامۆستا عەبدولكەریمی بیارە، لەبەر ئەوەی لەوێ زۆر ماوەتەوە.

. مامۆستا عەبدولكەریمی شارەزووری[6]، دەدرێتە پاڵ شوێنی هۆزەكەی.

. مامۆستا عەبدولكەریمی كوردی[7]، دەدرێتە پاڵ گەلەكەی.

---

[1] بنوارە (رسالة سراج القلوب)، شێخ عثمان محمد سراج الدين الثاني : 76 .

[2] فوائد الفوائح در شرح منظومة (فوائح) : 369 .

[3] تەفسیری نامی : 224/7 .

[4] خولاصەی تەفسیری نامی :631/3 .

[5] بەدیع و عەروزی نامی : 8 .

[6] وەك لە كۆتایی پەرتوكی رسائل العرفان : 214 و نامەی هوشیار:205 ورسائل الرحمە: 109و283 دا هاتووە .

[7] وەك لە كۆتایی پەرتوكی (إرشاد الأنام إلى أركان الإسلام)دا دەفەرموێ: (وأنا المؤلف في المدرسة الگيلانية ببغداد المحروسة ، عبدالكريم محمد الكردي الشهرزوری): 258 .

## سیفاتی مامۆستای مودەڕڕیس

مامۆستای مودەڕڕیس بالآی ناوەندیو بەرەو كورتی دەنواندو لەم دواییانەداو لە كاتی نەخۆشیو پیریدا زۆر بچوكی دەنواند وەك هێمنی شاعیر لەوەسفیدا دەڵێ: "جارێك لەگەڵ چەند مامۆستای گەورەو ماقوڵ لە بارەگای حەزرەتی غەوس لە حوجرە تەنگو چكۆلەكەیدا لە خزمەتی مامۆستا دانیشتبووین، من ئەم بیرەم بەمێشكدا دەهات ئەگەر هەموو نووسینە بەنرخەكانی ئەم مامۆستا كورتە بالآ، ڕەزا سوكە، خوێن شیرینو قسە خۆشە بێنێو لە تایەكی تەرازووی باویو جەستەی لاوازی خۆشی لەتایەكەی دیكە بخەی، ئایا سەری وەمیچی حوجرەكەی ناكەوێ"[1].

بەردەوام جبەی لەبەر كردووەو زۆر حەزی بەڕەنگی قاوەیی دەكرد[2]، مێزەرێكی سپی جوان ڕەنگی لەسەر دەناو بەبینینی دڵی سپیو خاوێن دەكردەوەو پاكیو نەزاهەتی مامۆستاشی دەگەیاند.

زانایەكی لەخواترسو زیرەكو وەلآم بەدەست بوو، زمان پاراوێكی خۆش قسەو گفت بوو، مامۆستا تاهیری بەحركی لەوەسفیدا دەلآ: بەڕاستی مەجلیسی پڕخێرو بەرەكەتبوون باسی دنیات بەخۆشی دەبیست، ئەوماوەی لە خزمەتی دەمایەوە هەستت بەخۆشی دەكردن لەتوبا هەڵنەستی"[3].

قوتابیانی خۆی زۆر خۆشدەویستو هەمیشە لێبوردەیی بەرامبەر بەكار دەهێنانو بگرە تەنها ژیانی ناو فەقێیانو مزگەوتی بەژیان دەزانی[4].

مامۆستا زۆر بەوەفابوو، بەڵكە لە هەموو سیفەتەكانی تری، ئەم سیفەتەی دیارتر بوو[5] ئەمەش بەڕوونی لە كتێبەكانیدا بەرچاو دەكەوێ.. كە هەركەس چاكەیەكی لەگەڵ كردبێت لەبیری ناكاتو باسی دەكاتو بەنزای خێر بەسەری دەكاتەوەن بۆ نموونە بنوارە علماؤنا[6] چۆن وەسفی شێخ جەمیلی تالەبانیو هەردوو كوڕەكەی شێخ عەلیو شێخ عەبدوڕڕەحمان دەكات، یان چۆن وەسفی شێخ عومەری قەرەداغی لە ڕۆژگاری ژیانم (84 ـ 92)دا دەكات[7]و هەر لەو سەرچاوەدا باسی دوو گەنجی سلێمانی موحەممەد سالحو موحەممەد سەعید دەكاو پیاوەتییان لەیاد ناكات كە وەختێ فەقێ بووە یارمەتییان داوە[8] هەروەها بنوارە ئەو وەفایەی كە بەرامبەر بەشێخی بیارە هەیەتیو چۆنی دەلاوێنێتەوە لە بنەماڵەی زانیاراندا[9].

یەكێكی تر لە سیفەتە بەرزەكانی مامۆستا، موتالەعەی چڕوپڕو بەردەوامەو هیچ كاتێك دەرسێكی بەبێ موتالآو خۆ حازركردن نەوتووەتەوە، ئەمەش یەكێكە لە ئامۆژگارییەكانی ئیبن قەرەداغی كە پیادەیكردووە.

مامۆستای مودەڕڕیس زۆر غەمخۆری گەلەكەی بوو، كە دەیبینی ڕۆژ بەڕۆژ نەزانی ئاوقایان دەبێتو دەكەونە گێژاویەوە هەربۆیە دەبینی بوێرانە دەستیدایە نووسین بەكوردیو زۆر لایەنو سوچی خاڵی كتێبخانەی كوردی ڕۆشنو ڕووناك كردەوەو كوردیش بەزمانی خۆی توانی تەقە لە دەرگای زۆرێك لە زانستەكانی علومی قورئانو حەدیس و بدیعو عەروز.. بداتو ئەو دەرگایە بەدەستی مودەڕڕیس، خرایە سەر پشت بۆ نەوەی ڕابوونی ئیسلامیی.

---

[1] پێشەكی دیوانی نالی (چاپی دوەم)هێمن .

[2] چاوپێكەوتنێك لەگەڵ د.محمد گەزنەیی–سەرۆكی یەكێتی زانایانی ئیسلامی – بە مێژووی 2005/7/24ز، لە بارەگای یەكێتی زانایانی سلێمانی .

[3] مێژووی زانایانی كورد: 76/9 ، دەسنوسێكی مامۆستا طاهری بەحركی یە لە مەكتەبەی بەحركە .

[4] . دیمانەیەكی كورت لەگەڵ عالیەخانی كچی مامۆستای مودەریسدا، ڕۆڤار ژمارە/ 14، ل 38.

[5] دیمانەیەك لەگەڵ مامۆستا محمد علی قەرەداغی ، لە 2005/7/25ز ، لە مزگەوتی گەورەی سلێمانی .

[6] علماؤنا في خدمة العلم والدین: 328 .

[7] بنوارە ڕۆژگاری ژیانم: 84–92 .

[8] بنوارە ڕۆژگاری ژیانم: 63 .

[9] بنوارە بنەماڵەی زانیاران: 416 .

## کاردانەوەی زانایان لەسەری

زانایان کاردانەوەیان لەسەر یەکدی بووە لە ئارامگرتنو سووربوون نووسینو داڕشتنو سەخاوەتو.. وێکچوون لە نێوانیاندا بووە، تایبەت گەر لە زەمەنێکدا ژیابنو تایبەتی تریش گەر قوتابیو مامۆستا بووبن.. تەنانەت لە شێوازی بیرکردنەوەو بگرە لە هیواکانی خوێندنیشدا.

مامۆستای مودەڕڕیس ـ ڕەحمەتی خوای لێبێ ـ موتەئەسیر بووە لە ژیانی خۆیدا بە زۆرێك لە گەورە پیاوو ناوداران و زۆریش کاردانەوەیان لەسەر دروست بوونی کەسایەتیی زانستی ئەوبوە لە تەقاندنەوەی گرو تینە شاراوەکانیو بیرفراوانکردنیو چاندنی هیواو ئاواتی بەرزو گەورە لە نووسینو وانە وتنەوەو بەردەوامی ئەودا دەستی دیارو بەرچاویان هەیە.

وەڵێ پێش ئەوەی بچمە سەر باسی ئەم کەسایەتییانە پێمخۆشە ماندووبوونی دایكو باوکی بنرخێنم لە سەرەتای گەشەی مودەڕڕیسدا کە چۆن بابی سۆفی موحەممەد دەستی دەگریو دەیخاتە سەر ڕێڕەوی خوێندنو دایکیشی ـ کە زۆر هیوای گەورەیی بە کوڕە تاقانەکەی هەیەو بە (حاجی مەلا عەبدولکەریم) نەبێ قەتاو قەت بانگی نەکردووە[1] ـ هانی بەردەوامی خوێندنی دەدا دوای کۆچی دوایی مێردەکەی، کە ئەمە وا لە مودەڕڕیس دەکات بەبێ پچڕان لەسەر خوێندنەکەی بەردەوام بێت.

مامۆستای مودەڕڕیس کاردانەوەی دوو گەورە کەسایەتی لەسەر بووە، ئەوانیش (شێخ عمری) ناسراو بە (ابن القرداغی)و (شێخ عەلائەددینی نەقشبەندی)[2] یەو مودەڕڕیس زۆر بە ڕوونی ئەمەی پێوە دیارە:

یەکەمیان: کەسایەتییەکی زانستییەو زۆر سیفاتی بەرزی لە مامۆستای مودەڕڕیسدا چاندووەو هەر لەویشەوە فێری نووسینو شێوازی تاقیق بووەو بە ڕوونی مودەڕڕیس ئەمەی وتووە: "هیچ کەسایەتییەك لە زانستو وانەبێژیدا سەرسامی نەکردووم، تەنها مامۆستام شێخ عمری قەرەداغی نەبێ"[3].هەروەها هەریەك لە شێخ موحەممەد عەلی قەرەداغی[4] و دکتۆر سەلاحەددین سەنگاوی[5]، ئەم ڕاستییەیان بۆ دووبارە کردمەوە کە مامۆستای مودەڕڕیس هەمیشە باسی (ابن القرداغی) دەکردو سەرسامی خۆی دەردەبڕی.

(ابن القرداغی) توانی کیانێك بۆ مودەڕڕیس پێك بێنێو کەسایەتی زانستی بەهێز کات لە پێش چاوی خەڵکیدا، تایبەت کاتێك تەشریف دەباتە بیارە لە بەهاری (1347ك)داو لە پێشچاوی شێخی عەلائەددین و خەڵکی بیارەو تەنانەت ئەوانەی دژایەتی موددەرریسیشیان دەکرد فەرمووی: "ئەم زاتە لە من مەلا تر ئەبێت ـ ئەگەر شێخ لوتف بفەرموێ لە گەڵیا ـ ئەوەی ئێمە زانیومانە لە خوێندنا وەری گرتووە بەهۆی تەدریسەوە ئەتوانی زیادەشی بخاتە سەر"[6].

بەردەوام نامە گۆڕینەوە لە نێوانیاندا گوزەراوەو زیاتری لە بیست نامە لە (ڕۆژگاری ژیانم)دا هاتووە لە (ابن القراغی)یەوە بۆ مامۆستای مودەڕڕیس، کە لە ڕێیانەوە ئامۆژگارییەکانی خۆی ئاڕاستەی مودەڕڕیس کردووە.

دیارترینی ئەم نامانە ئەو نامەیە کە سەبرو بەردەوامی لەسەر وانەبێژی دەداتە مامۆستای مودەڕڕیس لە ڕۆژگاری ساردبوونەوەو ناڕەحەتی مودەڕڕیس بە هۆی کۆچی دوایی خێزانی یەکەمییەوە کە تێیدا هاتووە (انشاء الله) خەریك

---

[1] بنواڕە باوەشێنی دڵ بۆ چەن بەستەی گوڵ/ 9. دەستنوسێکەی لە ژیانی مودەرریس تا واردبوونە بیارە.

[2] شێخ علاء الدین کوڕی شێخ عمر ضیاء الدین کوڕی شێخ عوسمانی سراجەددینی نەقشبەندی لە ساڵی (1280ك ـ 1863ز) لە دایك بووەو لە ساڵی (1373ـ 1953) وەفاتی کردووە. بنواڕە علماؤنا: (404 ـ 406)و بنەماڵەی زانیاران (416 ـ 418).

[3] بنواڕە مجلة الفتوى ژمارە (61)

[4] دیمانەیەك لەگەڵیدا لە 2005/7/25، لە مزگەوتی گەورەی سلێمانی.

[5] دیمانەیەك لەگەڵیدا لە 2005/9/18 لە ماڵی خۆیان گەڕەکی ئاشتی/ سلێمانی.

[6] ڕۆژگاری ژیانم، (114).

بوونت بە وانە بێژییەوە لە جاران زیاتر دەبێ و غەمی منداڵەكان لەمەدوات ناخات و (ومن يتوكل على الله فهو حسبه)[1].

دوەمیان: (شێخ علاء الدين) كەسایەتییەكی ڕۆحییەو دەستی مودەڕڕیسی گرتووەو خستوویەتییە سەر ڕێڕەوی تەسەوف و مامۆستای مودەڕڕیسیش بە پێشەواو مرشدی ڕۆحی خۆی قەبوڵی كردووەو دوای ئەویش تەمەسوكی بە كەسی ترەوە نەكردوە.

شێخی عەلائەددین هانی مامۆستای مودەڕڕیسی داوە لەسەر خوێندن كاتێ قوتابی بووە لە خانقای (دورود)و وەك باوك چاودێری كردووەو لە ڕووی ماددیو مەعنەوی یارمەتی داوە تایبەت ڕۆژگاری گرانی گەورە[2].

سیفەتی سەخاوەت و یارمەتیدانی هەژاران هەر لەو ساتەوە لە مودەڕڕیسدا چەكەرەی كردووەو دیاردەكەی بە ئاشكرا دەبینرێ، كاتێ مامۆستای مودەڕڕیس لە بەغداد دادەنیشێ و یارمەتی لێقەوماوانی كورد دەدات كە ڕێیان دەكەوێتە بەغداد بۆ پاروە نانێكی بژێوی یان لەبەر شیفایەك بۆ نەخۆشییەكانیان، بە ڕاستی حوجرەكەی گەیلانی خانەی بێنەوایان و لێقەوماوانی كورد بوو، هەزاران كورد شاهیدی ئەم ڕاستییە دەدەن و من بۆ خۆم چەندەها جار یارمەتی مودەڕڕیسم بینیوە بۆ لێقەوماوانی كورد و داماوی بێ جێ و ڕێم دیوە لە كنجوڕی حوجرەكەی مامۆستای مودەڕڕیسدا حەواوە تەوەو ئۆقرەی گرتووە.

لەدوای ئەوەی مودەڕڕیس ئیجازەی مەلایەتی وەردەگرێ و لە (نێرگزەجاڕ) دەبێتە مەلا، هەر شێخی عەلائەددین دەستی دەگرێ و لە بیارە دایدەمەزرێنێ و لە پەنای شێخدا بیست و پێنج ساڵ وانە دەڵێتەوەو چەندین مامۆستای بەرز لەسەر دەستی ئیجازە وەردەگرن.

لەمەوە بۆمان دەردەكەوێ مامۆستای مودەڕڕیس زۆر موتەئەسیر بووە بە دوو كەسایەتی یەكێكیان كەسایەتییەكی بەهێزی زانستی و ئەویتریان كەسایەتییەكی ڕۆحی بەرزو پاك هەر ئەم كاردانەوەیە مامۆستای مودەڕڕیس دەكاتە زانایەكی سۆفی، دەكاتە موجتەهیدێكی دیندارو نووسراوەكانی شاهێدی ئەم ڕاستییەن.

## وەسف و ثەنای زانایان لەسەری

لە گەڵ سازدانی چەند دیمانەو چاوپێكەتنێكدا لەگەڵ هەندێ زاناو ناودارو كەسایەتیدا، هەریەك بە چەشنێ وەسفی مامۆستای مودەڕڕیسی دەكردو لە ثەنای ئەودا بە جۆرێ دەپشكوا ئەمەش مشتێكە لە خەروارێك.

**1. شێخ تەییبی بەحركی:**

مامۆستا عەبدولكەریمی مودەڕڕیس–رحمه الله– زانایەكی بە تەقوا بوو، قەت ڕیای نەدەكردو خۆی لە دەسەلاتداران نزیك نەدەكردەوە، زۆر بە ئیخلاص بوو بۆ مەداریسی دینی، ئەوەی سەرسامی كردبووم ئەو ئەدەبە كوردانە كەوەری گرتبوو دانیشتنی چەند ساڵەی لە بەغداد پێی نەگۆڕی بوو[3].

**2. مامۆستا عەبدولقادری كوڕی حاجی ڕەسولی بەحركی:**

مامۆستام مودەڕڕیس–رحمه الله– هەركات یادی دەكەم وا دەزانم بەرامبەر زانای پایەبەرز ئیمامی (سیوطي) وەستاوم، هەمیشە وتوومە: بە ڕاستی ئەو (سیوطي) زەمەنی ئێمەیە، بە مەندە كۆتایی دێنم لە حەقیدا، خواڕەحممان پێ بكات بە هۆی بەرەكەت و شوێنەواری پاكییەتی ئەوەوە[4].

**3. دكتۆر موحەممەد ئەحمەد گەزنی:**

مامۆستای مودەڕڕیس بە نموونەی نووسەرو تاقیقیان لە نێوان زانایانی كورددا لە عێراق دێتە ژمارو بگرە لە نێو

---

1 بنواڕە ڕۆژگاری ژیانم: (110) نامەكە بە فارسییە.

2 بنواڕە علماؤنا في خدمة العلم والدين: 325 .

3 دیمانەیەك لەگەڵیدا لە 2005/6/24، لە ماڵی مامۆستا تاهیر بحركی برای لە بەحركە/ هەولێر.

4 دیمانەیەك گەڵیدا لە 2005/7/28، لە حي المهندسين لە هەولێر.

زانایانی گشت عێراق، هەروەها بە دەریایەك لە زانست قەڵەم ڕەو دەكرێ لە سەرجەم زانستە عەقڵیو نەقڵییەكاندا، بە سەرچاوەی تەقواو ڕەوشی بەرزی پەسەند حساب دەكرێ.

بە ڕاستی زۆر خۆ بەكەم زانە، زۆر بە سۆزە، لەگەڵ قوتابییەكانیدا بە بەزەییە، لەگەڵ گەلەكەیداو لەگەڵ هەموو خەڵكی، بڕوای زۆر بەتینە، پشت بەخوا بەستەیەكی بەهێزە، زانستو ژیانی خۆی تەرخان كردووە بۆ خزمەتی دینی پاكو بڵاوكردنەوەی بە هەرسێ زمانی عەرەبیو كوردیو فارسی[1].

4– دكتۆر عوسمان موحەممەد غەریبی هاشمی كوردی– یەكێكە لە مجازەكانی:–

ئێستە ئەوەم دێنێتەوە یاد كە دكتۆر عەبدولحەمید حەمەد شەهاب العبیدی . چاودێر لەسەر دكتۆراكەم، لەبەردەم سەرجەم مامۆستایانداو لە كاتی گفتوگۆی سەر نامەی دكتۆراكە فەرمووی:

"زانای عەللامە، موحەددیثی گەورە، شێخ عەبدولفەتاح أبو غدە سەردانی مامۆستای مودەڕڕیسی كرد لە بەغداو هاتە دەرەوە بە سەرسامییەوە وتی: قەت بە بڕوامدا نە دەهات لە بەغدادا كەسانی وەك شافعی هەبن لە زەمانی خۆیدا، بگرە لەویش زاناتر!!"[2].

5. شێخ موحەممەدی بەرزنجی – یەكێكە لە مجازەكانی –:

وەك وەفاو خۆشەویستییەك، وەك ڕاستییو هاوەڵایەتییەك دەمەوێ زانیارییەكانم لەسەر عەللامەی كوردستانی، هەڵكەوتووی ڕەببانی جەنابی مامۆستا عەبدولكەریمی مودەڕڕیسی كوردی بنووسم:

بەڕاستی بەڕێزی كەسایەتییەكی زانستیو دانەرێكی گەورە بوو جێگەی سەرسامی زانایان بوو، زاناو خواناسو تێگەیشتوو وانەبێژو شەرع زانو موفتیو سەرۆكی ڕابیتەی زانایانی عێراق بوو، مامۆستا –ڕەحمەتی خوای لێبێ– زۆر بە سۆزو میهرەبان بوو بەرامبەر ئوممەی كوردی بەتایبەتیو ئوممەتی ئیسلامی بە گشتی. تایبەتی تریش بەرامبەر زانایانو پیاوچاكان هەروەها وانەبێژێكی بە توانا بوو لە هەورامانو شارەزوورو سلێمانی و كەركوكو بەغدادا، لە قوتابخانەكەی ئەودا سەدان زاناو پسپۆڕ لە علومی عەقڵیو نەقڵیدا دەرچوونو لە زۆرینەی زانستەكاندا پەرتووكو نامیلكەی درێژو كورتی نووسیوەو ژمارەیان لە شەست تێدەپەڕێو زۆرینەیان بەچاپ گەیشتوون، من بە زۆرێكیان سەرسامم، بە تایبەت كتێبی (الوسیلة في شرح الفضیلة) و (شرح العقیدة المرضیة) و كتێبی (شەریعەتی ئیسلام) لە مەزهەبی ئیمامی شافعیدا ڕەحمەتی خوای لێ بێت[3].

6. مامۆستا عەلی باپیر:

–كە چەندین جار یەكتریان بینیوەو دان بەوەدا دەنێ كە چەندین جار وەصیەتو ئامۆژگاری مامۆستای مودەڕڕیسی پێگەیشتووە، كە بە پێویستی زانیوە بۆ كاری ئیسلامیی–:

مامۆستا . ڕەحمەتی خوای لێ بێ . خۆی یەكلا كردبووەوە بۆ علومی شەرعی بەوانە بێژیو فەتوادانو نووسین، خواپەرستو زاهیدو دنیا بە كەم گرو ئاخرەت ویست بوو، لەگەڵ گەورەیی تەمەنیداو زۆر مەشغەڵەتیدا بە غەم بوو بۆ كاروباری موسڵمانان –بە ئەندازەی ئاگاداری لێی–.

گەلێ خزمەتی گەورەی بە موسڵمانان گەیاند بە كوردو عارەبو توركمان لە عێراقداو لە ڕێی نوسراوو فەتواو ئامۆژگارییەكانییەوە.

شایەنی وەبیرهێنانەوەیە كە خزمەتەكانی مامۆستا عەبدولكەریمی مودەڕڕیس تەنها لە بازنەی زانستە شەرعییەكاندا

[1] بنوارە پێشەكی (المواهب الحمیدة): 6.

[2] پەیوەندییەكی تەلەفۆنی شەوی 2006/4/10 لە كۆیەوە.

[3] دیمانەیەك لەگەڵیدا لە 12/ربیع الأول/ 1427هـ لە ماڵی خۆیان ، سلێمانی.

نەبووەکە شێوازێکی کلاسیکی کە شکۆڵی لە خۆ گرتووە، بەڵکو ئەدەبی کوردیشی گرتووەتەوە کە ڕاڤەی چەندین دیوانی شیعری کردووەو زۆرێك گرێ کوێرەی شیعری شاعیرانی کوردی وەك (نالی)و (مەحوی)و.. ڕەحمەتی خوایان لێبێت، کردۆتەوە.

وەلێ هەر ڕاستی حەقە بگوترێ . ئەم مامۆستا پایە بەرزە ئەم فەقیهە گەورە، ئەم ئەدیبە بەڕێزە، وەك پێویست حەقی خۆی نەدرایە لەلایەن گەلەکەیەوە، تایبەت لەسەر ئاستی فەرمیو سیاسیی نەبەزیندوویی‌و نە بە مردوویی . بەداخەوە. کە هیچ گومانی تێدا نییە بۆچوونی عەلمانییەت . کە مەشخەڵی قیادەی سیاسیی ڕەسمی کوردە . دەستیان هەبوو چۆن دەست بونێك لەم هەڵوێستە نەیارە سووكو بێ ڕێزەدا(1).

7. مامۆستا نوری فارس

بەم چەند شیعرە عەرەبییە بەشداری کردو فەرمووی:

عــلماء امة الهدى أرواحنا

لهم الفدى سور لدينك خافر

ألقت مواكبهم بكوبة من ال

كــرد الهداة بهم تقر نواظر

من بينهم زين الشيوخ شيخنا

عبدالكــريم لدين أحمد ناشر

بوركت يا ابن الكردي سوف تفاخر

امم بكم وبعلــمكم ستناظر

لخوالد الكتب العظام نــوادر

و مؤلفاتكم لتلك بــوادر

سارت خزائن الكنوز فانها

لخير مجمــع العلوم مصادر

تفنى الجبال والكتاب سيخلد

ففي الجنان للهداة مــنابر

بالنور مكتوب على جبينه

سيماه في هذا الشعار ظاهر

نور الوقار على الجبين اذاسما

يعني هنا روح الديانة حاظر[2].

---

[1] دیمانەیەك لەگەڵیدا لە 17/جماد الأول/1427ﻫ لە مەکتەبی سیاسیی کۆمەڵی ئیسلامیی لە سلێمانی.

[2] دیمانەیەك لەگەڵیدا لە 12/ربیع الأول/1427ﻫ لە مامۆستایان ـ سلێمانی.

## ئەو پلەو وەزیفانەی بینیویەتی

لەگەل ئەوەی مامۆستای مودەڕڕیس بە گوزەرێکی نائارامیی سیاسیدا تێپەڕیوەو لەگەڵ ئەو بارە ئابوورییە داتەپیوەی ولآتەکەیدان، توانیویەتی هەندێ پلە وەرگرێ‌و لە چەند وەزیفەیەکدا بەشدار بێت لەم باسەداو بەپێی تاریخەکانیان ڕیزیان دەکەم.

1. بووەتە مامۆستا لە قوتابخانەو حوجرەی (نێرگزەجار) ئەمەش لە ساڵی (1347ك /1924ز) هەتا کۆتایی ساڵی (1346ك / 1927ز)[1].

2. بووەتە مامۆستاو وانەبێژ لە (خانەقای بیارە) لە سەرەتای ساڵی (1347ك / 1928ز) تا ساڵی (1371ك / 1951ز)[2].

3. بە فەرمی بووەتە وانەبێژ لە مزگەوتی (حاجی حان) لە سلێمانی ئەمەش لە ساڵی (1371ك . 1951ز) تا ساڵی (1374ك / 1954ز)[3].

4. چووەتە کەرکووك‌و لە (تەکیەی حاجی شێخ جەمیلی تاڵەبانی)[4]. ماوەتەوە وانە بێژبووە لەم تەکیەدا لە ساڵی (1374ك / 1954ز) تا ساڵی (1380ك/ 1960ز)[5].

5. بووەتە پێشنوێژو وتارخوێن لە مزگەوتی (أحمدی) لە نزیك وەزارەتی دیفاعی ئەوسا لە بەغداد، ئەمەش لە ساڵی (1960ز) دوای دەرچوون لە تاقیکردنەوەی وتارخوێنی‌و پێشنوێژیدا[6].

6. دامەزراوە بە وانەبێژ لە قوتابخانەی (عاتکە خاتوون) لە مزگەوتی شێخ عەبدولقادری گەیلانییدا، لە جەمادی یەکەمی (1380ك / 1960ز)[7].

7. لە دوای ئەوەی ساڵی (1393ك /1973ز) خانەنشین کراوە لەلایەن بنەماڵەی شێخی گەیلانییەوە، شەرەفی مانەوەی لە مزگەوتی گەیلانی پێبەخشراوە بۆ فەتوادان بۆ موسڵمانان‌و پێشنوێژی کردنی عەسرو نیوەڕۆو دواتر بووەتە موفتی هەموو عێراق[8].

8. سەرۆکی ڕابیتەی زانایانی موسڵمان لە عێراق بووە لە ساڵی (1974ز – 2003ز)[9].

9. لە ئەندامە کاراو دیارەکانی کۆڕی زانیاری عێراق بووە، لە ساڵی 1978ز تا کۆچی دوایی، وەلێ کارایەتی مامۆستا لە کۆڕدا لە پازدە ساڵ تێپەڕ ناکات‌و دواتر ئەندامی شەرەفی کۆڕ بووە[10].

---

[1] بنواڕە ڕۆژگاری ژیانم: (93)و (106)، ئەوەی لە (علماؤنا في خدمة العلم والدين) (327) نوسراوە کە گوایە ماوەتەوە تا ساڵی (1348ك) هەڵەیەو ڕاستەکەی ئەوەیە کە لە سەرەوە نووسراوە .

[2] بنواڕە (علماؤنا: 328).

[3] بنواڕە هەمان سەرچاوە.

[4] شێخ جەمیلی کوڕی شێخ موحەممەد ئەفەندی کوڕی شێخ عەبدوڕڕەحمانی تاڵەبانی، لە ساڵی 1892ز لە دایکبووەو پیاوێکی دیندارو خادمی ئەهلی عیلم بووە، لە ساڵی 1961ز کۆچی دوایی کردووەو هەر لە (تەکیە) نێژراوە، بنواڕە بنەماڵەی زانیاران: (593 ـ 594).

[5] بنواڕە (علماؤنا): 328 ـ 329.

[6] بنواڕە (علماؤنا): 329، ڕۆژگاری ژیانم: 240.

[7] بنواڕە ڕۆژگاری ژیانم: 240.

[8] بنواڕە (علماؤنا): 329.

[9] بنواڕە (خولاسەی تەفسیری نامی): 634/3.

[10] بنواڕە خولاسەی تەفسیری نامی: 634/3. بۆ هەموو ئەوانەی لە دوی ڕاستی ئەگەڕێن: 41.

## مامۆستا و قوتابیانی

**أ– مامۆستاكانی:**

مامۆستای مودەڕڕیس لای مامۆستاگەلێ خوێندویەتی، لە بەحری پڕ زانستیاندا لێوانیكێ هەڵگۆزیوەو لە سنگی خۆیدا كۆی كردووەتەوەو پاش بوونە دەریا لە لێوی شیرین و قەڵەمی ڕەنگینییەوە زەنگۆڵ زەنگۆڵ لێی ڕژاوەو قوتابی گەلێكی تینو لێی تێراو بوون.

ئەمەش ناونیشانی هەندێك لە مامۆستاكانیەتی:

**1. مەلا عەبدولواحیدی كوڕی مەلا عەبدوڵلای هەجیجی:**

لە ساڵەكانی 1303ك دا لەدایكبووە، لای جەنابی باوكی لەدێی (بالك) خوێندویەتی و گەڕاوە بەدوای زانستدا، هۆگری مامۆستا عەبدولقادری مودەڕڕیسی بیارە بووەو ئیجازەی لە خزمەتیا وەرگرتووەو یەكەمین كەسێكە كە زمانی مدریسی بەپیتەكان ناساندووە، یەكێكە لە دۆستەكانی صۆفی موحەممەدی باوكی مودەڕڕیس و لە دەوروبەری ساڵی 1352ك لە ساوجی نزیك مەریوان وەفاتیكردووە[1].

**2. مەلا مەحمودی جوانڕۆیی:**

لە ساڵەكانی دەوروبەری 1300ك لەدایكبووە، مامۆستای (بالك) بووەو پاشان چووەتە دەرتفێ و لە ساڵی 1363ك وەفاتی كردووە[2].

**3. مەلا ئەحمەدی ڕەش:**

زانای پایەبەرزی ناسراو بە (مەلای ڕش) خەڵكی گوندی (پاش بەرد)ی پێنجوێنە، لە دەوروبەری 1313ك لەدایكبووەو ئیجازەی لەخزمەتی مەلا عەبدولقادری مودەڕڕیس وەرگرتووەو دواتریش لە مەلا ئەبوبەكری ئەفەندی بڕوانامەی وەرگرتووە، ئەو زانایەكی وانەبێژی زۆر سەركەوتوو بووە، لە ساڵی 1373ك وەفاتی كردووە[3].

**4. شێخ عومەری ناسراو بە ئیبن ولقەرەداغی:**

عەلامەی تێگەیشتوو، پیاوچاكی پێگەیشتوو، شێخ عومەری كوڕی شێخ عەبدوللەتیفی گەورەی كوڕی شێخ مەعروفی دەرەقوڵە، لە ساڵی 1303ك لە شاری سلێمانی لەدایكبووە، ئیجازەی مەلایەتی لای شێخ نەجیبی قەرەداغی وەرگرتووە، زانایەكی وردەكار بووەو حاشیەو پەراوێزی لەسەر زۆرێك لە پەرتوكە زانستییەكان هەیە، لە ساڵی 1355ك ـ 1936ز وەفاتیكردووەو لەگردی سەیوان نێژراوە[4].

**5. شێخ سلێمانی كوڕی فەقی عوسمان.**

**6. مەلا شەریفی كانی سانانی.**

**7– مەلا عەزیزی بالیكەدەری.**

**8. مەلا عەبدوللەتیفی بانەیی.**

**9. مەلا فەیزوڵلای تاڵش.**

**10. مەلا عارفی كوڕی مەلا عەبدوللەتیفی هەجیجی.**

**11. شێخ بابە ڕەسوڵی بەرزنجی.**

[1] بنەماڵەی زانیاران/ 507 ـ 509.

[2] علماؤنا : 563.

[3] هەمان سەرچاوەی پێشوو: 86 ـ 87.

[4] ڕۆژگاری ژیانم: 84 ـ 92.

**12. سەید موحەممەدی كوڕی سەید ئەمینی گیزەملی.**

**13. مەلا موحەممەد سەعید عەبابەیلەیی.**

**14. حاجی مەلا عەزیزی دەرتفێیی.**

**ب –قوتابییەكانی:**

**لەڕاستیدا قوتابییەكانی مامۆستای مودەڕڕیس هێندە زۆرو بەربڵاون، كە لە مەقدەرەتی مندا نییە ناویان تۆمار بكەمو ئەویشی كە دەینووسم مشتێكە لە خەروارێك، وەلێ هەوڵدەدەم چەندی پێم كرا ساڵی ئیجازە پێ بەخشینیان بنووسمو تۆمار بكەم:**

1. مەلا موحەممەد زاهدی كوڕی حاجی صاڵحی پاوەیی، 1351ك–1933ز ئیجازەی پێبەخشراوەو یەكەمین ئیجازەی مامۆستای مودەڕڕیسی لە بیارە بەدەست هێناوە.

2. مەلا ئەسەدوڵڵای تاڵش، هەمان ساڵ.

3. سەید حسامەدینی موكریانی 1355ك–1936ز.

4–سەید بەهادینی خوڕخوڕەیی 1356ك–1937ز.

5–مەلا خچری ئالوثي ئالانی، هەمان ساڵ.

6–شێخ ئەحمەدی سەردەشتی، هەمان ساڵ.

7–شێخ عومەری عزی دیرەزوری كوڕی شێخ ئەحمەدی سوری 1357ك–1938ز.

8– مەلا عەلی جوانڕۆیی، هەمان ساڵ.

9– مەلا محمودی وەیسەیی، هەمان ساڵ.

10. مەلا سەعیدی بالكی 1358ك–1939ز.

11– مەلا محسنی ئەڵمانەیی، هەمان ساڵ.

12. شێخ موحەممەی كوڕی شێخ مارفی نەرگسەجاڕیی، 1359ك–1940ز.

13. مەلا محمدأمینی موكریانی، هەمان ساڵ.

14–مەلا قادری كوڕی حاجی ئەحمەدی هارونی، 1360ك–1941ز.

15. مەلا مەجیدی كانی ساردی وارماوایی، هەمان ساڵ.

16. مەلا ئەحمەدی كوڕی سۆفی مەحمودی كوێركی، هەمان ساڵ.

17. مەلا مەحمودی كانی بەردینەیی، 1361ك–1942ز.

18– مەلا علی كوێركی، هەمان ساڵ.

19. مەلا صاڵحی كوڕی سۆفی عەبدولقادری ژاڵەناوی، 1362ك–1943ز.

20. مەلا فەتاحی شاتری، هەمان ساڵ.

21. مەلا صدیقی كوڕی خەلیفە مەلا ڕەحیمی هۆشاری، 1363ك–1944ز.

22– مەلا سعیدی گلەچاڵی 1364ك–1945ز.

23– مەلا مجیدی وەلەدبەگی، هەمان ساڵ.

24– مەلا محمدی كوڕی مەلا أحمدی هۆشیاری 1368ك–1949ز.

25. مەلا موحەممەد ئەمینی بانەیی، هەمان ساڵ.

26. مەلا عەبدولقادری خۆشناوی، هەمان ساڵ.

27. شێخ نەجمەدینی كوڕی شێخ عەبدولقادری حەوتاشی، 1371ك–1952.

28– مەلا محمدی كوڕی عەباسی بانەیی، هەمانساڵ.

ئەو ناوانەی سەرەوە لە بیارە ئیجازەیان وەرگرتوە، لە سلێمانیشدا مامۆستای مودەڕڕیس ئیجازەی هەر یەك لەم مامۆستایانەی داوە:

29. مەلا موحەممەد ئەمین گەورە دێیی، 1375ك–1956ز.

30. مەلا خدری مەنگوڕی، هەمان ساڵ.

لە كەركوك ئیجازەی ئەم مامۆستایانەی داوە:

31. مەلا ڕەشیدی كوڕی حاجی كاكەحمەدی قوڵی جانی، 1376ك–1957ز.

32. مەلا عومەر ڕەشیدی نۆ دەریاویی، 1377ك–1958ز.

33. مەلا حسینی كۆیی، هەمان ساڵ.

لە بەغدادیش زۆر مامۆستا لە خزمەتیدا سودمەند بوون و ئیجازەیان وەرگرتوە ئەمەش هەندێكیانن:

34. مەلا عەبدولقادری كوڕی شێخ ڕەسوڵی بەحركی(35).

35. دكتۆر عوسمان موحەممەد ئەلهاشمی.

36. شێخ موحەممەد عەلی قەرەداغی، لە ساڵی 1968 ئیجازەی وەرگرتووە،

37. دكتۆر موحەممەد مەلا ئەحمەدی گەزنەیی، وەزیری ئەوقاف، سلێمانی لەساڵی 1969ز ئیجازەی وەرگرتووە.

38. مامۆستا یاسین دەروێش.

39. مەلا موستەفای كۆزەپانكی.

40– دكتۆر صلاح الدین ی سەنگاوی، 1965ز.

لەگەل داوای لێبوردنماندا بۆ سەرجەم قوتابیانی تری مامۆستای مودەڕڕیس كە دەگونجیٚ هەندێكیان مامۆستاشم بووبن، وەلیٚ لەم كاتەدا لەیادم نین‌و داوامە لە سەرجەم ئیجازەپێدراو و قوتابیانی مامۆستا ئاگادارم بكەنەوە، زۆر سوپاسیان دەكەم و بابەتەكە دەوڵەمەندتر دەكەن.

## دانراوەكانی مامۆستای مودەڕڕیس

**یەكەم: بەزمانی كوردی:**

1. سەرچاوەی ئاین: ئەم پەرتووكە، لە 1982ز بە چاپ گەیشتوە و لە شەش نامیلكە پێكهاتووە كە ئەمانەن:

أ. ئیمان‌و ئیسلام: لە عەقیدەدا نوسراوەو وەرگیراوە لە كتێبی (عەقیدەی هەورامیانە)ی مەلا حامدی كاتبی سراجەدین، كە بەشێوە زاری هەورامی نووسراوە، لەساڵی 1352ك–1933ز لە بیارە دایناوە.

ب . ئەساسی سەعادەت: شیعرە لەباسی ئادابی ئیسلام‌و ئەركانی ئیمان لە ساڵی 1354ك–1935ز لەسەر شێوەی پرسیارو وەڵام نووسیویەتی.

ج . ئاوی حەیات: ژیاننامەی ئەو پێغەمبەرانەیە، لەقورئاندا ناویان هاتووەو پاشان باسی عەشەرەی موبەششەرەو چوار ئیمامەی موجتەهید دەكات، ساڵی 1358ك–1939ز لەبیارە نووسیویەتی.

د . چل چرای ئیسلام: ڕاڤەی چل فەرمودەی پێغەمبەرە ρ ساڵی 1373ك–1954ز لە سلێمانی نوسوییەتی.

ه . نورو نەجات: شیعرێكی كوردییە لە مەدحی پێغەمبەرρو هاوەڵانیدا، ساڵی 1375ك–1956ز لە كركوك نوسراوە.

و . ئیقباڵنامە: هۆنراوەیە، وەرگێڕاوی پەرتووكی (دولت نامە)ی مەلا خزری ڕوداریی‌یە، كە بەشێوەزاری هەورامی لەساڵی 1353ك–1934ز نوسراوە.

7. مەولودنامەو میعراج نامە، لە ساڵی 1378ك–1959ز لە كەركوك نووسیویەتی و لەساڵی 1982ز بەچاپ گەیشتوە.

8. دووڕشتە: فەرهەنگێكی عەرەبی كوردییە، ساڵی 1385ك–1966ز نووسیویەتی‌و 1992ز بە چاپ گەیشتوە.

9. بەهارو گوڵزار: حیكمەت‌و دانایەتییە مامۆستای مودەڕڕیس هۆنیویەتەوە، لەساڵی 1977ز بە چاپ گەیشتوە.

10. شەریعەتی ئیسلام: وەرگێڕاوی (منهاج الطالبين)ی نەوەوییە، چوار بەرگەو دانراوی ساڵی 1378ك–1958ز تا ساڵی 1381ك–1961ز یە.

11. وتاری ئاینی بۆ ڕۆژانی هەینی: بەزمانی کوردیو پوختەیەکی عەرەبی لە ساڵی 1380ك–1961ز لەبغداد نووسیویەتی و لە 1970ز بە چاپ گەیشتوە.

12. بارانی ڕەحمەت: هۆنراوەیەکە بەژیانی پێغەمبەری خوا ρ دەست پێدەکاتو دواتر کورتە ژیانێکی چوار خەلیفەکەو پاشان چەند بابەتێکی فیقهی کۆتایی دێنێ بەچەند باسێك لە باوەڕودا، لە ساڵی 1354ك–1935ز نووسیویەتی و لەساڵی 1958ز بە چاپ گەیشتوە.

13. یادی مەردان: دوو بەرگەو بەرگێکی باسی مەولانا شێخ خالیدی نەقشبەندیو بەرگەکەی تریش باسی شێخ عوسمانی سراجەدینە، بەرگی یەکەم لە 1979ز بە چاپ گەیشتوە و دوەم لە 1983ز و دوەم بەرگ لە علماؤنا بە (پەیڕەوان)ناوزەند کراوە.

14. دیوانی مەولەوی: لێکۆڵینەوەو ڕاڤەی شیعرەکانی مەولەوییە و لە ساڵی 1959ز دانراوە و لە 1961ز چاپ کراوە.

15. ڕاڤەی شیعرەکانی دیوانی (نالی) فاتحی کوڕی هاوکاریکردووە لە 197ز بە چاپ گەیشتوە.

16. ڕاڤەی شیعرەکانی دیوانی (مەحوی) لە ساڵی 1382ك–1962ز دایناوەو لە 1979ز بەچاپ گەیشتوە.

17. کۆمەڵە شیعرێکی فەقێ قادری هەمەوەندی، فاتحی کوڕی هاوکاری باوکی کردووە و لە 1980ز بەچاپ گەیشتوە.

18. حەج نامە: لەباسی ئادابی حەج.

19. ڕاڤەی (عەقیدەی مەرضیە)ی مەولوی لە عیلمولکەلامدا لە 1988 بەچاپگەیەنراوە.

20. مەکتوباتی کاك ئەحمەدی شێخ: وەرگێراوە لە فارسییەوە پەنجاو پێنج مەکتوب و نووسراوە، لە 1984–1991ز لە چوار بەرگدا چاپکراوە.

21. بنەماڵەی زانیاران: باس لە هەندێ بنەماڵە ناسراوەکان دەکات، کە شۆرەتیان بەزانستو دین بلاّوبوەتەوە و لە 1984ز بە چاپ گەیشتوە و لە علماؤنا بە (بنەماڵەکانی کوردستان) ناوی هاتووە.

22. تەفسیری نامی، حەوت بەرگە لە تەفسیری قورئاندا، لە ساڵی 1980–1984ز بە چاپگەیشتوە.

23. خولاسەی تەفسیری نامی: سێ بەرگە، بۆ خۆی کورتیکردوەتەوە لە 1985زدا.

24. نوری قورئان: لە علومی قورئاندا، لە ساڵی 1319ك–1971ز دانراوە لەبغداد و لە 1985ز بە چاپ گەیشتوە.

25. ڕێگای بەهەشت: لە ساڵی 1987 بەچاپگەیەنراوە.

26. نامەی هوشیار: ساڵی 1409ك–1988ز لە بغداد نووسراوە و لە 1992ز بە چاپ گەیشتوە.

27. شەرحی (فتح القريب): لە فیقهی پێشەوا شافیعی.

28. بەدیعو عەروزی نامی: لە 1409ك–1989ز لە بغداد نوسراوە و لە 1991ز بەچاپگەیشتوە.

29. ڕێگای ڕەهبەر: لەزانستی علوم حەدیسدا لە ساڵی 1402ك–1982ز لە بغداد نوسراوە و لە 1985ز چاپکراوە.

30. سەناو سکالاّ، لە ساڵی 1406ك–1986ز لە بغداد دانراوە لە 1987 چاپکراوە.

**دووهەم: بەزمانی عارەبی:**

31. جواهر الفتاوى: فەتوای زانا گەلێکی کوردی تێدا کۆکردۆتەوەو لەفەوتان قوتاریکردوون، سێ بەرگەو لە ساڵی 1382ك ـ 1962ز دایناوە ولە 1969–1971زبە چاپ گەیشتوە.

32. جواهر الكلام في عقايد أهل الاسلام: کتێبێکی نایابی عەقائیدە،کە خۆی هۆنیویەتەوەو ڕاڤەیکردووە، لەساڵی 1411ك ـ 1956 دایناوە و لە 1993ز بە چاپ گەیشتوە.

33. صفوة اللآلي من مستصفى الغزالي: لەزانستی (اصول الفقه) دایەو توانای مودەڕڕیس لەم زانستەدا دەخاتە ڕوو

مەودای تێگەیشتنی لە ئوصول بەدەردەخات، ساڵی 1375ك . 1955ز لە كەركوك دایناوە و لە 1986ز چاپكراوە .

34. ارشاد السالك الى المناسك: لەباسی حەجدا نووسیویەتی، لە 1983ز چاپكراوە .

35. المواهب الحمیدة في الفریدة: لەزانستی (نحو)دا ئەمەی نووسیوەو زۆر بەجوانی (فریدە) كەی سیوتی ڕاڤە كردووەو لەدنیای فەوتان ڕزگاریكردووە، ساڵی 1374ك . 1954ز لە سلێمانی دایناوە ولە 1977ز چاپكراوە .

36. نور الایمان: لەزانستی عەقائیددا نوسراوە، لە 1978ز چاپكراوە.

37. ارشاد الأنام الى أركان الاسلام: لەزانستی فیقهدا نوسیویەتی، لە ساڵی 1408ك . 1987 دایناوە و لە 1990ز بە چاپگەیشتوە.

38. رسائل العرفان في الصرف والنحو والوضع والبیان: ئەمەش چەند نامیلكەیەكی لەخۆ گرتووە:

أ . الصرف الواضح للمبتدئین: ساڵی 1383ك-1963ز لە بغداد دایناوە.

ب . مفتاح الآداب: لەزانستی نەحوداو لە ساڵی 1393ك-1973ز نوسراوە.

ج . الخلاصة في الوضع والبیان والتبیان في الوضع البیان، ساڵی 1351ك-1932ز لە بیارە نووسیویەتی.

41. رسائل الرحمة في المنطق والحكمة: پێنج نامیلكەی لەخۆ گرتووە :

أ . المفتاح في المنطق: لەزانستی لۆژیكدا وەك سەرەتایەك زۆر بەسودەو ساڵی 1353ك-1934ز لە بیارە نوسیویەتی.

ب . الورقات في المنطق: ساڵی 1349ك-1930ز دایناوە .

ج . المقالات فی المقولات: هەمان ساڵ نووسیویەتی.

د . رسالة العزیزة في المنطق: ساڵی 1348ك-1929ز لە بیارە نووسراوە .

ه . الوجیهة المرضیة في المواجهات: لە ساڵی 1349ك-1930ز نووسراوە .

46 . اعلام بالغیب واهام بلاریب: ڕاڤەی هەندێ فەرمودەی پێغەمبەرﷺ لە 1992ز چاپكراوە.

47. نور الاسلام: لەزانستی عەقائیددا نووسراوە، لە ساڵی 1397ك-1977ز دایناوە و 1978ز چاپكراوە.

48. علماؤنا في خدمة العلم والدین، ساڵی 1401ك-1981ز نووسیویەتی و لە 1983ز چاپكراوە، بەڕاستی لەم پەرتووكەوە مامۆستا وەك كەشكۆڵێك بۆ زانایانی كورد دەردەكەوێت.

49. مواهب الرحمن فی تفسیر القران: حەوت بەرگە لە تەفسیری قورئاندا لە 1984ز لە بغداد دایناوە و لە 1986-1989ز چاپكراوە .

50. خلاصة منظومة جواهر الكلام في عقاید أهل الاسلام: كورتكراوەی پەرتوكی جواهر الكلامی خۆیەتی، لە 1992ز لە بغداد كورتی كردوەتەوە و لە 1992ز چاپكراوە .

51. الرسالة وأنوارها: سەبارەت بە پەیامی پێغەمبەران‌و موعجیزەكان، لە 1989ز چاپكراوە .

52. اسناد الأعلام الی حضرة سید الأنام، لە 1995ز چاپكراوە .

53. الفرائد الجدیدة على المطالع السعیدة، ڕاڤەی (مطالعی سیوطی)یە لەزانستی نەحودا.

54. الوردة العنبریة في مدح خیر البریة: ساڵی 1413ك . 1992 دایناوە و لە 1994ز چاپكراوە .

55. الأنوار القدسیة في الأحوال الشخصیة.

56- الوسیلة في شرح الفضیلة، ڕاڤەی (الفضیلة)ی مەولەوی یە، بە عارەبی لە عیلمی كەلامدا و لە 1959ز لە كەركوك نوسیویەتی و لە 1972ز لە دوو بەرگدا چاپكراوە.

**سێهەم: بەزمانی فارسی:**

57. نامیلكەی (شمشێر كاری بر نسیمی رستگای) وەڵامە بۆ پەرتوكی (نسیمی رستگاری) كە لەسەر ئیجتیهاد و تەقلید ئایەتوڵلا موحەممەد مەردوخی سنەیی نووسیویەتی‌و مامۆستای مودەڕڕیس وەڵامی بۆ نووسیوە، لە ساڵی 1356ك دایناوە .

58. فوائد الفوائح در شرح (منظومه الفوائح) كە مولوی لە عەقائداو بەزمانی فارسیی هۆنیویەتەوەو مودەڕڕیسیش شیكە ڕاڤەیەكی كردووەو مەولەوی مەلەوان لە فارسیدا ناساندووە بە عەجەمستان.

**دەستنووسەكانی مامۆستای مودەڕڕیس:**

لەڕاستیدا مامۆستای مودەڕڕیس كتێب گەلێكی هەن كە هێشتا بەدنیای چاپنەگەیشتوون، من ناڵێم هەموویان دەنووسم، بەڵكو ئەوەی بەردەستم كەوتووە، زانیاریم لەسەری هەیە قامكی بۆ درێژ دەكەمو ئومێدمە قوتابیانو شوێنكەوتووانی بتوانن سودیان لێوەرگرنو پاش لێكۆڵینەوە چاپیان بكەن.

59. العلمان في العلمين: لەزانستی (وضع و استعارة) دا لە ساڵی 1373ك نووسراوە .

60. شرح حدائق الصمدیە لەزانستی نەحودا نووسیویەتی.

61. العقد الذهب في جید الأدب، لەزانستی (بدیع وعروض)دا داینـاوە.

62. خلاصە التبیان، لەساڵی 1374ك داینـاوە.

ئەمانە هەمووی دەستنووسنو بەعەرەبی نووسراون.

بەزمانی كوردیش ئەمانەی نووسیوە:

63. نامەی حەقیقەت، ساڵی 1362ك داینـاوە .

64. ڕۆژگاری ژیانم: دەستنووسێكی زۆر جوانەو لەبەسەر هاتو ڕۆژگاری ژیانی خۆی نووسیویەتی (256) لاپەڕەی خورشیدییەو بەدرێژی تا ساڵی 1969 ژیانی خۆیی تیا نووسیوە .

65. سۆسەنی كۆسار: ئامۆژگارییە بۆ موسڵمانان لە ساڵی 1419ك نووسیویەتی.

66. وەنەوشەی نازار: لە ساڵی 1403ك داینـاوە .

67. پەیڕەوان، باسی خەلیفە دیارەكانی شێخ عوسمان سراجەدینی یەكەمو كوڕەكانی دەكات.

68. باخچەی مەعریفەت: لە ساڵی 1373ك نووسیویەتی.

69. ڕاڤەو لێكۆڵینەوەی شیعرەكانی سالم.

70. ڕاڤەو لێكۆڵینەوەی شیعرەكانی بێسارانی.

71. شەمامەی بیندار: فەلسەفەو ئامۆژگارییە.

72. نامەی بەختیار: ئامۆژگاری گشتییە بۆ مسوڵمانان لە ساڵی 1384ك داینـاوە .

73. ڕاڤەی تەصریفی زنجانی، بەكوردی لەزانستی صەرفدا.

74. باوەشێنی دڵ بەچەند دەستە گوڵ باسی ژیانی خۆی دەكات تا بوونە مامۆستا لە بیارە، پاشان وەك وەفایەك باسی شێخەكانی نەقشی دەكات بە مەولانا خالید دەست پێدەكاتو بە شێخ (عومەر ضیاءالدین) كۆتایی دێتو مەخابن ئەم كتێبەی تەواو نەكردووە بە خەتەكەیدا پێدەچیٚ لە تەواوی پیریو دەست لەرزۆكی نووسیبێتی.

دەستنووسە فارسییەكان بریتین لە:

75. (شهاب سما در رجم جن جان نما): ئەمەش وەڵامە بۆ كتێبی (جان نما) دانراوی ئایەتوڵڵای مەردرخی لە عەقیدەدا، شێخی مودەڕڕیس لە 1357ك وەڵامی بۆ نووسیوە.

76. فیوضاتی خدای ذی من: ڕەددی پەرتووكی (یزدانو أهریمن): دانراوی ئایەتوڵڵای مەردۆخییە كە هەم كتێبەكەی مەردۆخیو هەم وەڵامەكەی مودەڕڕیس هۆنراوەیە، ساڵی 1358ك داینـاوە .

77. گلزاری حكمت در رباعیات فارسی: نامیلكەیەكە لەسەر شێوەی هۆنراوەی فارسی لەگەڵ چەند چوارینەیەكی فارسی ساڵی 1377ك داینـاوە.

78. هۆنراوەیەكی فارسی لە زانستی تەجویددا، ساڵی 1373ك نووسیویەتی.

79. ڕای رحمت حق: شیعرە بە فارسی.

## ناساندنی (ڕۆژگاری ژیانم)

(ڕۆژگاری ژیانم) لە نووسینی مامۆستا عەبدولکەریمی مودەڕڕیس دەستنوسێکە لەو دەستنوسانەی بە خەتی مامۆستا خۆی نووسراوەو لە (256) لاپەڕەدا نووسراوەو قەبارەی لاپەڕەکانیشی (20 × 28.5)سم هەر لاپەڕەش (32) دێری لە خۆ گرتووەو دیارە مامۆستا بەمەرەکەب و قامیش نووسیویەتی.

خەتی ئەم دەستنوسەر زۆر ڕوون و ئاشکراو جوانەو کەسێ تۆزێ شارەزایی خەتی مامۆستا بێت، زۆر بە سادەو ڕەوانی دەیخوێنێتەوە، مامۆستا بەڕێسای نووسینی مەلایانەو دێرین دەنووسیێ و هەندێ جار حاشیەو پەڕاوێز بە چواردەورویدا دەهۆنێتەوە.

مامۆستا پێش دەستپێکردن بە کتێبەکەی پێڕستێکی نووسیوە وەڵی هەمووی تەواو نەکردووە تا سەرگوزشتەی (مەولەشێت) ڕۆیشتووە، ژمارە لاپەڕەی پێڕستەکە هەڵەن بۆ نمونە (هۆزی قازی ل11) کەچی لە لاپەڕە (8) دایە، باسی (مەولە شێت ل/45) ئەو لە لاپەڕە/67 دایە و بەم چەشنە...، پێدەچێ ژمارەی لاپەڕەکانیش دواتر نوسرابن.

لە لاپەڕە (3)دا ناوی بڕێك لە نووسراوەکان و ساڵی دانانیان نووسراوە، وەڵی هەندێ لەو ناوانە لە کاتی چاپدا گۆڕاون و دەبێ بە وردی تەماشا بکرێن، بۆ نمونە (البستان في فتاوى علماء كردستان) چاپ کراوە، بە ناوی (جواهر الفتاوى)، هەردووك هەر یەك کتێبن و نابێ بە دوو حساب بکرێن، یان هەندێ لەو کتێبانە لەگەڵ کتێبی تر چاپ کراوەو دووبارە بە نووسراوی سەربەخۆی مامۆستا حساب ناکرێن، بۆ نمونە (كشف الغامض عن أحكام الحائض) کە لە (1348) نووسیویەتی لەگەڵ کتێبی (جواهر الفتاوى) چاپ کراوەو بە شێکە لەو کتێبە.

لە لاپەڕەی (4)دا ناوی ئەو قوتابیانەی نووسیوە کە لە بیارە ئیجازەی مەلایەتی پێ بەخشیون و مێژووی ئیجازەکانیشی نووسیوە، (27) قوتابی بیارەو یەك قوتابی سلێمانی و پێنج قوتابی کەرکووکی تۆمار کردووە کە موجازی مامۆستان.

لە لاپەڕە (5)دا بە ساڵی کۆچی ڕۆژی لە دایکبوونی (موحەممەد فاتیح و محمد و عالیە وموحەممەد نجیب وصلاح الدین و عطیە)ی لە مندالەکانی نووسیوەو لە خوارەوەش لە دایك بوونی شیلانیی کچی صەلاحی تۆمار کردووەو لە کۆتاییدا نزای عاقبەتی خەیرو ئیمان و سەلامەتی بۆ کردوون.

ئینجا لە لاپەڕە شەشەوە دیباجەکەی مامۆستا دەست پێدەکات[1].

مامۆستای مودەڕڕیس لەم نووسراوەدا زۆر کات لە ژیانەکەی خۆی تێدەپەڕێ و هەندێ باس کە مەبەستیەتی زۆر درێژەی پێدەدا، بۆ نمونە زۆر بە دریژەی باسی هۆزی قازی و هەسەن دەکات و شەجەرەکانیان دەنووسێ و لە لاپەڕە (8 – 13)ی کتێبەکەی ئەو باسەیە، یان هەندێ کەسایەتی هەن وەك وەفایەك ژیانیانی بە درێژی نووسیوەتەوە وەك شێخ عمری ئیبنولقەرەداغی کە لەلاپەڕە (84 – 92) باسی ژیان و قیافەو خووڕەوشتی دەکات، یان باسی ڕشتەی ساداتی بەرزنجە لە شێخ عیساو شێخ موساوە، یان پیر خدری و کاکوزەکەریاکان، یان باسەکانی مەریوان و ئەمیر حەمزەو..

کورتی و پوختی دەمەوێ بڵێم: (ڕۆژگاری ژیانم) کە شکۆڵ ئاسا زۆر شتی جوان و زۆر باسی ناسکی لە خۆ گرتووەو ئەوەندەی بۆم ڕۆشن بووەتەوە دەرەنجامی خوێندنەوەم بۆ مامۆستاو نووسراوەکانی مامۆستا بەدوری لە کوردستان زۆر غەمبار بووەو عاشقێکی بێ وێنەی ئەم خاکە بێ وێنەیە، سەرسامە بە دارو ڕووبارو هەواو پیاو ماقوڵ و زانای ئەم خاکە، هەموو مەبەستیشی دوو شتە:

یەکەم: دەیەوێ هەویە و تاریخێك بۆ ئەم گەلە کە بە هۆی دینەوە پەیدا بووە نەپوکێتەوە.

دووهەم: ئەم هەمووە زاناو گەورە پیاوەی کورد ناویان نەفەوتێ و تۆزی زەمەن نەیان شارێتەوە.

ئیتر ئەم دڵە ناسکە بەم هەمووە عیشق و ئەوینەوە دەیەوێ ژیانی خۆی بنووسێ نەبادا گەلی مردووی ئەمیش بمرێنن و

[1] بۆ زیاتر چاوەڕوانی خوێنەر چەند لاپەڕەیەکی (ڕۆژگاری ژیانم) کۆپی دەکەین، بنواڕە پاشکۆی ئەم کتێبە.

کە دەگاتە بابەتێكو دەزانێ گەلەکەی مراندویانە یەکسەر قەڵەمی ئەویندار دەگریو دەچێتە سەر ئەو باسەو کەمێك دەیلاوێنێتەوە .

بەهەر حاڵ من بۆ ئەوەی خوێنەر بە مامۆستای مودەڕڕیس و ژیانی پڕ گەوهەری ئاشنا بێت، ئەم دەسننووسەم کورت کردوەتەوەو ئەوەی پەیوەست بە ژیانی خۆیەوە نەبێت نەمنوسیوەتەوەو تەرکم کردوە. بەڵام بەم هێمایە(...) ئیشارەتم بۆکردوەو هەندێ جاریش، گەر بەگرنگم زانیبێ پوختەکەیم لە پەراوێزدا باس کردوە.

لەنێو نوسینەکەشدا گەر ووشەیەك یان جملەیەکم بەپێویست زانیبێت بۆ ئەوەی زیادی بکەم خستومەتە نێو (.) و لە پەراوێزدا ئیشارەتم پێداوە .

هەندێ شێوەنوسینی مامۆستام گۆڕیوە وەك (دەرزێ) کردومە بە (دەرسی) یان (إسراحەت) کردوومە بە (ئیسراحەت)، ئەمەش لە هەمو جێیەکدا نەمکردوەو ویستومە چەشنی نوسینەکەی مامۆستا تێك نەدەمو تامی قەڵەمەکەی ئەو نەگۆڕم.

سەرباسم بۆ نوسیوەو هەندێك نوسراوەکەم زیاتر پێدەرخستوەو لە پەراوێزدا ئیشارەتم بۆ ئەمەش نوسیوە .

هەندێك نوسین گەر بە هەڵە پێش چاوم کەوتبێ، پەڕاندوومە جا یان پیت یان ووشەیەکم پەڕاندوە بۆ ڕاستکردنەوەی هەڵەکە زۆر کات لە پەراوێزدا ئیشارەم پێنەداوە، وەك (فاتحی لەگەڵیا خۆیا برد)ل610، راستەکەی (فاتحی لەگەڵ خۆیا برد) یان (پیای) کراوە بە (پیاوێ).

مامۆستای مودەڕڕیس ساڵەکانی بە نوسین نوسیوەو بەکۆچی تۆماری کردوە، من کردومە بە ژمارە و زاینییەکەشم بۆ زیاتر ڕوونی لەپەناوە نوسیوە.

ماوە بڵێم: خوێندنەوەی ژیانی هەر هەڵکەوتویەك، کۆپلە واتایەك لەخۆ دەگرێ، کە دەبێ خوێندنەوەی تایبەتی بۆ بکرێ و، لێکۆڵینەوە لەسەر: 1-هۆکاری پێگەیشتن. 2-بەرهەڵستەکان لەبەردەم پێگەیشتن. 3-خاڵە سەرکەوتوەکان لەژیانی ئەم کەسایەتییە. 4- شێوازی نوسین و قەڵەمی. 5-خزمەتی گەل و نیشتمانی. 6- تایبەتمەندی ئەم کەسایەتییە. 7-خاڵە لاوازەکان لەژیانی ئەودا.. زەرورەتێکی باسی مێژویی وورد و زانستین.

ئەم نووسینەی ئێمەش گەر چی تەقەی لە هەندێ لەوانەی سەرەوە داوە، وەلێ مەبەستی سەرەکی تێیدا وەفایەکە بۆ ئەو زانا گەورەیەی زۆر زانای ئەم وڵاتەی بە زیندوویی هێشتەوە، بە زیندوویی ژیانەکەی بهێڵینەوەو بۆ نەوەی داهاتوو خزمەتێك پێشکەش بکەین .

# مامۆستای مودەڕڕیس بە پێنووسی خۆی بناسە

## دیباجە

بسم الله الرحمن الرحيم

الحمد لله الذي خلق الانسان، وكرمه بالفضل والاحسان، فميزه بالعقل والعلم والقلم واللسان، والصلاة والسلام على سيدنا محمد الذي هو في عين الوجود انسان وعلى آله وصحبه واتباعه بالاحسان الى يوم الدين.

لە لای ئینسانی هوشیارا دیارە، هەر ئینسانێ لە ماوەی ژیانی خۆیا گەلێ كارەسات ئەبینێ، كە بە سەری خۆیا، یا هاوڕۆژەكانیا بێت گەلێ شتی بەسوودو بار[1]، بۆ خۆی یان بۆ ئەوان دەست ئەكەوێت، ئەگەر ئینسان هۆی ئەو شتانە تەماشا بكات، ئەو ڕوداوانە بە خۆیانن و هۆكانیانەوە بنووسێتەوە، بۆ پاشەڕۆژی خۆی و هاو زەمانەكانی، بۆ چینی دواكەوتووانی ئەوانیش زۆر بەسوود ئەبن.

هەروا گەلێ شت بەراورد ئەكا كە ئەبن بەسەرمەشق بۆ هاونیشتمانەكانی بۆ غەیری ئەوانیش لە موستەقبەلا لەسەر ڕووناكی ئەوانە ڕەفتار بكەن، بۆیە (سعدی) فەرموویەتی:

مرد هیز مند پیشـــەرا    عمر دو بایست در ئین روزگار

تا زیكی تجربە ارد بە بند          و ز دگردی تجربە ئارد بەكار

جا لەسەر ڕووناكی پێشوو، من ئەمەوێ ڕووداوی زەمانی خۆم، ئەو كەسانەی كە لەگەڵیانا بووم – ئەوەی لە بیرما مابێ– بیان نووسم لەبەر چەند شت:

یەكەم: وەزعی ژیانم لەلای دۆستان، عەلاقەت دارانم ون نەبێ.

دووەم: وەزعی ئەو كەسانە لەم نامەدا ئەیان نووسم دەركەوێ.

سێهەم: هەر پەندێكی سوودمەندیان تیادا هەبێ ڕەفتاریان پێ بكەن.

چوارەم: بۆ خۆم لە ماوەی دوایی ژیانما بە تەماشاكردنیان بە بیرەوەری حاڵی خۆمو دوستانم دڵی خۆم تۆزێ لە تۆزو تەمی غەم پاك بكەمەوە.

وە ئەم نووسراوانەم ناونا بە (ڕۆژگاری ژیانم)[2] لە میهرەبانی یەزدانی پاك داوا ئەكەم كە ئەم دەفتەرە[3] بكا بە هۆی سوودی سەعادەتو پیرۆزی ئەوانە تەماشای ئەكەن:

گەلێ لە زانای خاوەن بیرو هۆش    گەلێ ئەدیبی بوساغی تێكۆش

گەلێ مەردانی بە عەقڵو ویژدان    زۆر پاڵەوانی ئامادەی مەیدان

گەلێ دڵ پاكی بۆ مەردوم دڵسۆز    زۆر دڵ ڕووناكی خاوەن عەشقو سۆز

گەلێ دڵبەری سەروی سنۆبەر    كە تانەی ئەدا بالأی لە عەرعەر

گەلێ بەخشندەی خاوەن خانەدان    پەنای ڕۆژی ڕەش بۆ حاجەت مەندان

مردنو گیانیان گەیشتە بەهەشت    باسێكیان نەما نە لە شار نە دەشت

مایەی ئازارە بۆ دڵی هوشیار    سوودێ وەرنەگرێ لە چەرخی دەووار

تۆماری دەوری خۆی نەكاتەوە    ئاوڕ بۆ حاڵی كەس نەداتەوە

نەكا بەسەرمەشق ئیشی پێشینان    نەكا بە ڕێگە ڕێی تێكۆشینیان

جیهان قەڵایەو ئینسان پاسەوان    نارەوایە بۆی نووستنی شەوان

---

1 لە دەستنووسەكە بەم چەشنە نووسراوە (گەشتی بەسود و بارە)و ڕاستییەكەی ئەوەی سەرەوەیە كە نووسیومە .

2 لە دەستنووسەكەدا (ڕۆژگاری ژیان) نووسراوە.

3 لە دەستنوسەكەدا (كە ئە دەفتەر بكا) نووسراو.

پێویستی مەردە لە ڕووی جیهانا          بێدار بی لە گشت ماوەی ژیانا
مەبەستی (نامی) لەم تولی و عەرزە          ئەمەیە بۆ مەرد کەرامەت فەرزە[1].

## ڕیشەی نەسەبی خۆم

باوکم موحەممەدی کوڕی فەتاح کوڕی سلێمان کوڕی مصطفی کوڕی محمد خەجێ لە عەشیرەتی (هۆزی قازی)، دایکی باوکم ریحان کچی نصر الله خەڵکی دێی (کورەمێو) لەلای پێنجوێن دا.

باوکی باوکم فەتاح لەگەڵ عەزیز ناوی برایا ظریفة ناوی خوشکیا لەلای باوکەوە لە(هۆزی قازی) وەلەلای دایکیەوە لە (هۆزی هەسەن) ن، ئەمانە لە ناو هۆزی قازیدا لە دایك بوون، پاش ماوەیێ لەناو عەشیرەتەکەیان دەرچوون، وەموددەتیێ لە دێی (کەولۆس)، وەپاش ئەوە لە دێی (چەوتان) دانیشتوون، هەتا باپیرەم فەتاح ژنی هێناوە ئەمجار لەو دێ دەرچوون، هاتوون بۆ دێی (تەکیە) لە خواری مەرکەزی ناحیەی خورماڵەوە، لە دێی تەکیەدا کە موڵکی شێخ بهاء الدین بوە بە زارعی دانیشتوون.

ئەم هاتنەیان بۆ (تەکیە) لە دەوری تاریخی 1275ك–1858ز بووە، دایکی باوکم لە پێش پەیدا بوونی باوکمدا دوو کوڕی تری بوە یەك لە دوای یەك، یەکەم محمد مصطفی ناو دووەم محمد شریف ناو، لەم سەردەمەدا لەگەڵ بەخێو کردنی مناڵەکانی خۆیا شیری داوە بە شێخ حسام الدین کوڕی شێخی بهاءالدین کە ئەم کوڕە لە (طیبة خان) ی کچی سید عبد الرحمن بیەلەنگەیی بووە.

محمدی باوکم هەر لە دێی (تەکیە)دا لە تاریخی 1285ك–1878ز دا لە دایك بووە[2]

وەهەر لە تەکیەدا گەورە بووە، پاش چەن ساڵێ باوکی باوکم فەتاح لەدێی تەکیەدا وەفاتی کردوە.

پاش ئەمە عزیزی مامی باوکم لەو دێ دڵی هەڵکەنراوە و گوێزاویەتەوە بۆ دێی ڕەشان لەلای (پێنجوێن)دا، وەدایکی باوکم لەبەر ئەوەی چاوی لە کوڕەکەیەوە بێ شوی کردوە بە مامە عزیز، پاش چەن ساڵێ لە ڕەشانەوە لەبەر هەنێ کارەسات لە ڕەشان گوێزاویانەتەوە بۆ (بەییلە)، وەلەوێ مەشغوڵی زەراعەت کردن بوون، لە دەوری تاریخی 1310ك–1892ز دا دایکی باوکم لە عزیزی هێوەری کوڕێکی محمد ناوی بوە پاش ئەو کچێکی خەجێ ناوی بوە.

باوکم لە تاریخی (1315ك–1897ز) ژنی هێناوە، دایکم (خانم) ناو لە عەشیرەتی (سورەجو)یی بووە، کە لە نزیکی شانەدەریدا دانیشتوون، لە تاریخی 1317ك–1899ز ئامینەی خوشکم لە دایك بوە، لە (1321ك–1903ز) لە ئەوەڵی

---

[1] ئەم دیباجەیە لە گۆڤاری (ستاندەر)دا بڵاو نەکراوەتەوە.

[2] لێرەوە ئەو هەڵە بەربڵاوە ڕەد دەبێتەوە کە دەڵێ مامۆستای مدرس لە تکیە لەدایك بوە، لێرەدا بەڕونی مدرس دەڵێ: باوکم لە (تکیە) لەدایك بوە، پاش وەفاتی باپیریشی کە فتاح بوە، نەنکی واتە دایکی باوکی شوی کردوەتەوە بە عزیزی برای فتاح کە هێوەری خۆی بوەو باریان کردوە بۆ (ڕەشان) لای پێنجوێن و دواتریش کە سۆفی محمدی باوکی گەورە بوەو ژنی هێناوە لە (سورەجۆ) هەر لەلای پێنجوێن و چەند جارێك باریان کردوە بۆ دیوی ایران و هاتونەتەوە هیچ باسێکی تری (تکیە)م نەخوێندوەتەوە لە دەستنوس و چاپکراوەکانی مامۆستای مودەرریسدا، ئیتر نازانم ئەم هەڵە چۆن بڵاو بویەوە دنیای ڕاگەیاندنی داگیرکرد و ڕاستی شاردەوە، بۆ جوانبینی ئەم هەڵە بنواڕە کوردستانی نوێ (ژ/2510) بابەتێکی صلاح عبدالقادر (ژ/3763) بابەتێکی بەرزانی مەلا تەها کە هەردوك ئەم هەڵەیان نوسیوە، هەروەها ژمارە (902) ڕۆژنامەی خەبات بابەتێکی ممتاز حەیدەری و لە رۆژار (ژ/14) هەمان هەڵەی تێدایەو هەفتەنامەی یەکگرتو (ژ/555) بابەتێکی غازی عەلی و هەروەها بابەتێکی ئومێد محمد قەرەزاغی لە (ژ/ 132)ی ڕۆژنامەی داهێنان و لە (الافق)یش دا بە عەرەبی بابەتێکی محسن تحسین و شێخ فائق نامق لە بابەتێکی تری (الافق)ی (ژ/115)دا، ئەمانە هەمو ئەم هەڵەیان تێدا دوبارە بوەتەوە، هێندەی من ئاگادار بم، لەگەڵ ئەوەشدا دەستخۆشی لە هەمویان دەکەم و لە سەرجەم ئەو بەڕێزانەی ئەو زاتە گەورەیان بەسەر کردەوەو بە پێنوسی جوانیان مێژو و وەفاداریان نوسی و لە زۆرینەشیان سودم بینیوە و منیش چەندەها هەڵەم هەیە، تەنها مەبەستم ڕاستکردنەوەی ئەم هەڵەیە بو، لەژیانی ئەم زانا پڕ لە گەوهەرە بەو بۆ ئەم بۆچونەی خۆیشم بە تەلەفۆن پەیوەندیم لەگەڵ مامۆستا محمد علی قەرەداغی گەورە نوسەر کرد و لەرۆژی 2005/9/17 لە وەڵامدا فەرموی ڕاستر وەهایە کە مامۆستا لە دەوروبەری مەریوان لەدایك بوە، پێم وایە ئەم هەڵە لەم عیبارەتەوە سەرچاوەی گرتوە کە لە (علماؤنا/324) دەفەرموێ (**أنا عبد الکریم بن محمد المتولد في قریة "تکیة"**) و ئەو المتولدەیان بە سیفەت بۆ عبدالکریم گەڕاندوەتەوە، ڕاستیەکەی وەهایە کە بۆ محمد دەبێتە سیفەت و ئەقرەب مرجعە.

**بەهارا من لەدایك بووم [1]**

**وە لە 1322ك–1904ز دا، رابیعەی خوشکم لە دایك بوە، وەلە ساڵی 1325ك–1907ز دا باوکم وەفاتی کردوە (ل/7)... [2]**

**باوکم خوێندەوار بوو، وەموریدی شێخی بیارە شێخ علاءالدین بوە، زۆر صالح وەخزمەتگوزاری ئەهلی عیلم و صەلاحت بو، زۆر محەببەتی مەرحوم حاجی سید حسن ی چوڕی بوو، حاجی سید حسن لە سەفەری حەج دا (دلائل) یێکی چاپ ئەستەمبولی بە دیاری بۆ هێنا بو، تا ماوەییێ پاش فاتی باوکم ئەو دەلائلە مابو لە پاشا فەوتا.**

**من خۆم لە تەمەنی پێنج ساڵیدا لەبەر ڕەغبەتی باوکم لە خوێندنما نراومەتە بەر قوتابخانەوە، بیرم دێ مامۆستا مەلا عبدالواحد برای مەلا عارف کە لەوکاتا مەلای ئاوایی بو ئەلف و بێی نوسیەوە بۆم، خەتەکەی زۆر روناك بو، کە پرسیاریان ئەکرد لێم: ئەو حەرفە چۆنە نوختەی هەیە یا نە، چەن نوختەی هەیە، باش جوابم ئەدایەوە.**

**بیرم دێ پرسییان لێم (م) لەچی ئەچێ؟! وتم: لە مێزەرەکەی مامۆسا مەلا عبدالواحد، گەلێ بەجوابەکەم پێکەنین.**

**پاش ماوەیێ کەم قورئانم گەیاندە سورەی (زمر) ئەوەندە بەرچاوم کرابووەوە لەوە ژور گوێیان لێ گرتم، قەراریان دا پێویستم بە دەرزی قورئان نەماوە، لەو کاتا زیافەتێکی پلاوو گۆشتیان بە باوکم کرد بۆ شادیانەی قورئان خوێندنم.**

**مەرحومی باوکم لەپێش وەفاتیا بە چەن ڕۆژێ ڕۆیشت بۆ تەعزیەی یەکێ لە دۆستان، لەوسەرەوە کە هاتبۆوە، بە عاصاکەی خەتێکی لەژێر دارگوێزێ کێشابوو، فەرموبوی: ئەگەر من لەم ڕۆژانا مردم لەژێر ئەم دارا لەسەر حاسی ئەم خەتە بمنێژن.**

**ئەو ڕۆژە بۆ شەو وەصیەتی کرد بۆمان کە لە پاش خۆی تەرکی خوێندنم نەکەم، بە هەر وەزعێ ببێ هەر دەوام بکەم، دائیمە عەلاقەمان بەشێخی (علاءالدین)ەوە ببێ، هەروا قەراری دا کە کاغەز و قەڵەم و دەوات بۆ من بسێنێ و بنوسم نەکا**

---

[1] گەلی کورد مێژووی لە دایکبوونی ڕۆڵەکانی تۆمار نەکردوە لە کاتی خۆیدا، هەر بۆیە ئەوەی دەوترێ لە ڕۆژی لە دایکبوون و دیاری دەکرێت بۆ زانایەك لە سەدا سەد نیە و بە عەقڵ ولێکۆڵینەوە دەردەکەوێ ،سۆفی محمدی باوکی مامۆستای مودەرریسیش هیچی بۆ تۆمار نەکردوین وله پێش پێگەیشتنی ڕۆڵەکەیدا کۆچی دوایی کردوە ،ئیتر ئەوەی دەوترێ لە ساڵی لەداکبوونی مودەرریسدا تەخمینیە، تەنانەت ئەوەی مودەرریس خۆیشی دیاری دەکات لە سەدا سەد نیە، هەر بۆیە خیلاف و جیاوازی لە لە ساڵی لە دایکبوونیدا هەیە:

مامۆستا خۆی دەفەرموێ لە (علماؤنا/324) من لە ساڵی 1323ك–1905ز لەدایك بووم و لەم دەسنووسەش (رۆژگاری ژیانم/7) دەفەرموێ لە ساڵی 1321ك–1903ز لە دایك بووم.

وتەی یەکەم بەهێز دەبێ بەوەی کە لە (باوەشێنی دڵ بە چەند بەستەی گوڵ/8)دا دەفەرموێ لە 1323ك لەدایکبووم ،هەروەها من خۆم لە دیمانەیەکم لەگەڵیدا لە 2005/4/21ز لێم دوپاتکردەوە فەرمووی من لە 1323ك لە دایکبووم، وتەی دووەم بەهێز دەبێ بەوەی کە مەشهورە دوو پاش وەفاتی شێخ عمری بیارە لە دایك بوە، شێخ عمر لە 1318ك وەفاتی کردوە ئەمەش لە وتەی دووەمەوە نزیکە.

ئەوەش بۆ خۆم بۆم یەکلا بوەتەوە دوای وردبوونەوە و قاڵ بونەوە لە زۆرینەی نووسراوەکانی مامۆستا ئەوەیە کە مامۆستا لە دایکبووی کەمتر لە ساڵەکانی 1320ی کۆچییە، ئەمەش بە چەند بەڵگە:

یەکەم: موقابەلەی زۆرێك لە مامۆستایانم کردووە وەك مامۆستا محمد عەلی قەرەداغی گەورە نووسەر و دکتۆر محمد گەزنەیی سەرەك زانایان و مامۆستا تەییب بەحکی و مامۆستا تاهیر بەحرکی و شێخ طاهر إسماعیل قەرەداغی و...هەموان پێیان وابوو مامۆستا لەو مێژووە گەورە ترە .

دووەم: لێرەدا(رۆژگاری ژیانم/7) مامۆستا دەفەرموێ: باوکم لە بەهاری 1325ك وەفاتی کردووە، هەروەها دەفەرموێ(رۆژگاری ژیانم/23) : من خۆم لە تەمەنی پێنج ساڵیدا لەبەر رەغبەتی باوکم لە خوێندنما نراومەتە بەر قوتابخانەوە، لەلایەکی ترەوە دەفەرموێ کەفێری خوێندەواری بووە و قورئانی خەتم کردوە و باوکی شادیانەی بۆ گێڕاوە.

منیش دەڵێم گونجاو نیە باوکی لە (25) وەفاتی کردبێ و خۆیی لە (21)یان(23) لە دایکبووبێ و بە پێنج ساڵیش باوکی ڕەحمەتی وەبەر خوێندنی نابێ، شادیانەی بۆ قورئان فێربوونی گێڕابێ، کەوابوو: 1325ك پێنج ساڵی منداڵی لێدەرکە و دواتر سێ ساڵێکی بۆ فێر بوونی خوێندەواری و قورئان خەتمکردن لێ لابە، دەمێنێتەوە 1317ك بەم چەشنە: 1325–5–3=1317ك لەدایك بووە بەرامبەر 1899ز.

[2] لە (ل/8–22) مامۆستای مودەرریس بە درێژی باس لە هۆزی قازی دەکات، ئەسڵ و بناغەیان، وەچەو نەوەیان.

خۆی بمرێ وەپەکم بکەوێ.

دایکم لەم قسانە زۆر زویر بو، بەڵام ئێمە فامی ئەوەمان نەبو، بە خواستی خودا لەو ڕۆژانا پاش کڕینی کاغەز و قەڵەم بۆ من لە بەهاری ساڵی (1325ك–1907ز) وەفاتی کرد، (رحمه الله وطاب ثراه).

پاش وەفاتی باوکم: دایکم خودا عەفوی بکا زۆر حەولی لەگەڵمادا زۆر کۆششی کرد بۆ خوێندنم، ئەو هاوینە لەماڵی مرحوم مەلا محمدی کوڕی حاجی شێخ قادرا مامەوە، کتێبە ووردەکان وەکو (اسماعیل نامە و..) خوێند. لەم کاتا شێخ عزیزی خەڵکی (دۆڵ پەمو) لە خزمەتی

مەلا محمدا ئەیخوێند، لە ڕۆژی وەفاتی باوکیشما زۆر دڵخۆشی ئەدامەوە.

پاش ئەم تاریخە شێخ علاءالدین، مەلا محمدی برد کردی بە مدرسی خانەقای (دوروە) منیش لەم لاولا مەشغوڵی خوێندن بوم، بەینێ لەماڵی خۆمان، بەینێ لە (بەییلە)، بەینێ لە (ئەسراوا)، بەینێ لە (کانی سانان)، ماوەیێ لە (لنجاوا) بەکورتی تا ساڵی (1330ك–1911ز) بەخوێندن و پەککەوتن نەخۆشیەوە دەوامم کرد، ئەم جار لە مانگی محرم ساڵی (1330ك–1911ز) لە لەنجاوادا دەستم کرد بە (ل 23) (تصریفی زنجانی) لەو ساڵا تا بەهار تصریفم گەیاندە باسی مضاعف، لە بەهارا ڕۆیشتم بۆ (سەردوش) بۆ لای مەلا سلێمان کوڕی فقێ عثمان کە داوای خزمایەتی ئێمەی ئەکرد، باسی مضاعفم لە تصریف خوێند، دەستم کرد بە عوامل، بەڵام بیستم کە (مەلا محمودی جوانڕۆیی) هاتووە بۆ (بالك) بوە بە مدرس، لە سەردوش گوێزامەوە بۆ بالك، لەوێ عوامل و سعدالله ی بچوکم خوێند.

لە عەینی ساڵا مامۆستا مەلا عبدالواحد کوڕی مەلا عبدالصمد بو بە مەلای (گوێزە کوێرە) منیش لەبەر ئەوە کە ئەم زاتە مناسبەو دۆستی قدیمی لەگەڵمانا بوە ڕۆیشتم بۆ خزمەتی، لەخزمەتی ئەوا لە ساڵی (1332ك–1913ز) (أنموذج)م تا باسی (فعل) خوێند، پاش ئەوە (اظهار)م خوێند، پاش ئەو (تصریفی مەلا عەلی)م خوێند، دوو (رسالەی وضع واستعارة ی مەلا ابوبکری میر ڕۆستمی)م خوێند، پاش ئەمانە دەستم کرد بە کتێبی (جامی) جامیم گەیاندە باسی (تمیز)، ئەم ساڵە ساڵی (1334ك–1915ز) بوو، لە ئاخری ئەم ساڵا لە پایزا دایکم وەفاتی کرد.

لەپێش وەفاتی دایکما (آمنة)ی خوشکم شوی کردبو، لەپاش وەفاتی دایکم هەر زەخیرەو ئەشیائێکمان بو بارم کرد بۆ ماڵی پورە فاتمەی خوشکی دایکی بۆ دایکم، کە ماڵیان لە (دایران) بو، رابعەی خوشکیشم برد بۆ لای ئەو، بەقەی ئیمکان مصرفم بۆ ئەکرد.

ئەم جار گوێزامەوە بۆ (کانی سانان) بۆ خزمەتی مەلا شریف (جامی)م گەیاندە (توابع) پاش ماوەیێ لە ئاخیری پایزا ڕۆیشتم بۆ خزمەتی حاجی مەلا عزیز لە (دەرەتفی) ئەو زستانە لە خزمەتی ئەوا بەعزێ (جامی)م خوێند، لەپاشا دەستم کرد بە (سیوطی) تا بەهار گەیاندمە دەوری (موصولات)، لە بەهارا گەڕامەوە بۆ خزمەتی جەنابی مامۆستا عبدالواحد و لەسەر خوێندنی (سیوطي) دەوامم ئەکرد، بەڵام لەبەر ئەوە ڕۆژ بەڕۆژ دنیا تاریکتر ئەبو، گرانی دەستی پێکردبو، خەڵکی لە ئاشوبی جەنگی جیهانی زۆر پەرێشان بوون، منیش دڵم هەڵکەنرا، ویستم بڕۆم بۆ ووڵاتێ تر، تصادف لەو ماوەدا مەلا عبداللطیف نجنێیی بانەیی برای مەلا عبدالوهاب نجنێیی هات بۆ لای ئێمە، ئەیویست بڕوا بۆ (شاری سلێمانی) بۆ خوێندن، منیش لەگەڵ مەلا حسن ی بالیکەدەری دا لەخزمەتیا کەوتینە ڕێگە بۆ شاری سلێمانی، لە سلێمانیدا لە مزگەوتی مەلا عزیزی بالیکە دەری دامەزرام... (ل/24)[1].

[1] مامۆستای مودەرریس لە (ل/24–61) لە باسی سەفەرەکەی لادەداو دەفەرموێ( واز ئێنم لێرا لە باسی سەفەر ئەگەڕێمەوە بۆ هەنێ خەبەر ) ئیتر لە سەرەتاوە باسی پەشێوی دنیا و جەنگی جیهانی یەکەم و جیهادی کوردانی دلێر بەرامبەر ڕوس و شەهیدانی ئەم ڕێگە و بەشداری شێخی علاء الدین و....پاشان باسی مەریوان و ئاوو هەوا و ئابوری ئیدارەو ناودارانی ئەم ووڵاتە و گۆشەی ئایین و دین پەرستی مەریان و پەیوەندی ساداتی پیر خدری و بەرزنجی و کاکۆ زەکەریایی بەم خاکەوە دەکات و ڕشتەی ساداتی بەرزنجە دەهۆنێتەوە و شێخ عیسی و شێخ موسی و سید صاڵق و کابڵ و کاکە سوری و شێخ حسنی گڵە زەردە و زۆرێکی تر باس دەکات و نامە مەشهورەکەی نادرشا بۆ شێخ و وەڵامی پڕ کەرامەتی شێخ حسن بۆ نادر شا دەنوسێتەوە و....دێتە سەر باسی ئەمیر حەمزەی

**ئەم سەفەری منە لە خزمەتی مامۆستا مەلا عبداللطیفی برای مەلا عبدالوهابی بانەیی، مەلا احمدی خەراجیان، لەگەڵ مەلا حسن ی بالیکە دەری وەفقی حسێن ی طائربوغەیی دا، لە ئاخر مانگی زستانابو، چەند ڕۆژێ پێش نەورۆز، لە پێنجی ئەو مانگەوە باران نەباری، بەم هۆوە خەڵك زۆر نارەحەت بون، هەموو کەس دوعای بارانیان ئەکرد.**

**لەڕێگەدا شەوێ لە (دەرەتفێ) بوین، بۆ سبەینێ ڕێکەوتین هاتینە پێنجوێن شەوێکیش لە پێنجوێنا بوین لە مزگەوتی پاشادا، لەوێوە ڕێکەوتین بۆ ئێوارە گەیشتینە دێی (وولیاوا) شەو لەوێ بوین بۆ سبەینێ ڕێکەوتین بۆ ئێوارە گەیشتینە دێی (چنگیان) لە بەینی ئەم دوو دێدا دووجار توشی زەحمەت بوین:**

**یەکەم: لە چەمی (ئاشان) گەیشتین بە گەلێ (ضبطیة) کە لەلای خۆیان پاسەوانی ئاسایشی ڕێگەبون، ویستیان خۆیان بگۆڕن لێمان ڕوتمان بکەنەوە، بەڵام مەلا احمدی خەراجیانی یەکێ لەو جەماعەتەی ناسی بەهۆی ئەوەوە ڕزگار بوین.**

**جاری دوەم: لە نزیکی (نۆدێ) توشی گەلێ عەسکەر بوین بۆ پێنجوێن ئەڕۆیشتن، ئەوان پێڵاوی مەلا حسن یان برد، هەرچی پاڕاینەوە نەیان دایەوە، بە هەر چۆن بێ گەیشتینە (چنگیان) لەو ڕۆژا مەلا عارف مەلا بو مامۆستا مەلا قادری باوکیشی لەحەیاتا بو..**

**بۆ سبەینێ لە چنگیانەوە هاتین بۆ دێی (سیتەك) لەو کاتا (مەلا سلیمان) ناو مەلای سیتەك بو، کە لەپاشا بو بە نائب قازی لە ماوەت دائەنیشت، کە گەیشتینە سیتەك تەماشامان کرد خەڵکەکە لەسەر تەقالیدی ووڵات هەنێ ئاڵای قەبری صاڵحانیان هێنابوو، خستبویانە ناو حەوزی دێ بەئومێدی ئەوە باران بباریێ، زۆر زۆر بۆ باران چاوەڕێ بون، شەوێکیش لە سیتەك ماینەوە بۆ سبەینێ هاتین بۆ شاری سلێمانی.**

**وە بەهۆی ئەوەوە کە مەلا حسنی بالیکە دەری خزمی مەلا عەزیزی مدرس بو ئیمامی مزگەوتی مەلا محمد امینی بالیکەدەری (بو) لە مزگەوتی مەلا محمد امینی بالیکەدەری یا بەمیوانی دانیشتین، لەپاش شەوو ڕۆژێ منو مەلا حسنی بالیکەدەری لە عەینی مزگەوت دامەزراین، مامۆستا مەلا عبداللطیف، فقێ حسینی طائر بوغەیی لە مزگەوتی شێخ محمدی بەرزنجەیی دا دامەزرا، مەلا احمدی خەراجیانیش ڕۆیشتەوە بۆ خەراجیان کە دێی خۆی بوو...** (ل/62).

**لەخزمەتی مامۆستا مەلا عزیزدا مەشغوڵی خوێندنی سیوطی ئەبوم، بە فرصەت ئەڕۆیشتم بۆ خزمەتی مامۆسا مەلا عبداللطیف لە مزگەوتی شێخ محمدی بەرزنجیدا دەرزەکەم بە حاشیەی ابوطالبەوە ئەخوێندەوە، بەڕاستی لە خزمەتی مامۆستا مەلا عبداللطیف دا چاوم بۆ ووردەکاری خوێندن کرایەوە لەو ماوەدا لە مزگەوتی حاجی مەلا عزیز دابوم، دوو کوڕ لەو محلەی سەرشەقاما بون محمد صالح و محمد سعید ناو زۆر خزمەتیان کردین.**

**لەو بەهارا لە سلێمانیا ماینەوە، بەڵام ڕۆژ بەڕۆژ لەبەر بێبارانی شدەتی جەنگی یەکەمی عالەمی رزق گرانتر ئەبوو، وضع لە انسان تاریك ئەبوو بە هەرچونێ بێ مانگو نیوێ هاوینیش لە سلێمانی ماینەوە، ئیتر بڕیارمان دا بگەڕێینەوە بۆ هەورامان، وەیا علی الاقل شاری سلێمانی بەجێ بێڵین، بەڵام شێخ محمدی بەرزنجەیی کە مامۆستای مامۆستا مەلا عبداللطیف بوو هەمو ساڵێ لە هاوینا ماوەیێ ئەڕۆیشت بۆ بەرزنجە، فەقێکانی خۆیشی لەگەڵ خۆیدا ئەبرد، لەسەر ئەم یاسایە شێخ محمدی بەرزنجی نامەیێکی نوسی بۆ شێخێکی پیاو و مناسبی بەرزنجە کە مامۆستا مەلا عبداللطیف منو مەلا حسن فەقێ حسێن طائر بوغەیی ئەم چوار کەسە لەدێی بەرزنجە دابنیشین تا جەنابی شێخ محمدیش لە سلێمانی یەوە بێت بۆ بەرزنجە، ماوەیەك لە بەرزنجە (بین) تا بزانین وضع چۆن ئەبێ.**

**بەم خەیاڵە ئەم چوار کەسە لە سلێمانییەوە کەوتینە ڕێگە بۆ بەرزنجە، بۆ ئێوارە گەیشتینە (چنگیان) بۆ سبەینێ لەوێوە ڕۆیشتین بۆ دێی (شوکی) لەنیوەڕۆدا لەوێ اسراحەتمان کرد، پاش نان خواردن نوێژ کردن ڕێکەوتین بۆ بەرزنجە،**

---

بابان و مەلا ئەبو بەکری موصەننیفی چوڕی ورشتەی پیر خدری شاهۆیی و بنەماڵەی مەشایخی کاکۆ زەکەریایی و خەلیفەکانی شێخ شهاب الدین و زانا ئاینیەکانی مەریوان و بیست وسێ زانا ناو دێنێ و کورتە ژیانیان باس دەکات و دێتە سەر ئەدەب و شاعیران و کورتە ژیانی هەشتیان تۆمار دەکات و بە چەندین شیعر و نوکتە ی جوان ئەو چەند لاپەڕە دەڕازێنێتەوە و دواتر و لە سەرەتای (ل/62)دا دەفەرموێ (با بڕۆینەوە بۆ باسی سەفەر بە ئیزنی خودای دانای بەخەبەر).

بۆ ئێواره گەیشتینه بەرزنجە، بووین بە میوانی ماڵی ئەو شێخە کە شێخ محمد نامەی بۆ نوسیبو، گەلێ خزمەتیان کردین (ل/63)

کە ڕۆژ بووەوە تماشامان کرد جاف لە کوێستان بەو گەرمایە لەترسی هێرشی دوژمن ئێنە خوارەوە، دنیا وەضعی باش نییە، بڕیارمان دا لە بەرزنجە دانەنیشین وەرو بکەینە هەورامان، لەسەر ئەم بیرە ماڵ ئاواییمان لە شێخ کرد وەرێکەوتین بۆ طەرەفی هەڵەبجە، بەڵام ئەوڕۆژە لەدێی (موریاس) بەولاوە بەڕوی شارەزورا لەبەر گەرما بێ ئاوی زۆر پەرێشان بوین، بەحاڵا خراپ بۆ مغرب گەیشتینە دێی (تەپەکەل) کە عائد بو بە مرحوم شێخ حسام الدین، ڕۆیشتینە ماڵی کوێخا (حەمە کەرەم) ناو کە وەکیلی شێخی حسام الدین بوو، رحمە اللە.

ئەم زاتە ئەو شەوە گەلێ خزمەتی کردین، خودا جەزای بداتەوە، بۆ سبەینێ بەرەو هەڵەبجە ڕۆیشتین، بۆ سەعات چواری پاش نیوەڕۆ گەیشتینە هەڵەبجە لە مزگەوتی محمد پاشادا بەمیوانی ئاراممان گرت.

ئەم ڕۆژە زەمانی مرحوم شێخ عبداللطیف کوڕی شێخ محمدی قەرەداغی بو، بەعزێ طلبەی لە خزمەتا بو، یەکێ لەوان ملا محمدی پاوەیی بو، کە وارد بوین زۆر ماندو بوین، لەبەر هەیوانی مزگەوت دانیشتین، بە شەکر و چایی خۆمان چامان لێنا، کاتێ شێخ عبداللطیف تەشریفی هاتە مزگەوت، وەچاوی کەوت پێمان کە خۆمان چامان لێناوە، گەلێ لە طلبەکان عاجز بو، کە بۆچی ئەوان نەهاتون بەدەممانەوە، سوێندی لێ خواردین ئەبێ ئەو ڕۆژ و شەوە میوانی ئەوبین، بەڕاستی گەلێ دڵخۆشی داینەوە، خزمەتی کردین، تا سبەینێ لەخزمەتیا بوین.

بۆ سبەینێ ڕۆیشتی بۆ مدرسەی (عەبابەیلێ) لەو ڕۆژا مامۆستا مەلا عبداللە ی شێخ قادر مدرس بو گەلێ طلبە لە مدرەسەدا بون، جێگەی طلبەی زیادە نەبو، شەوێ لە عەبابەیلێ ماینەوە، بۆ سبەینێ لە پشتی عەبابەیلێوە بەڕێگەی کێوی شنروێدا ڕۆیشتین بۆدێی تەوێڵە، لە ڕێگەدا لەدێی بەڵخە لەباخێکا دانیشتین اسراحەتمان کرد، ماڵا بەعزێ فەریکە توی بۆ هێناین لەگەڵ کاسەیێ دۆی سارد و خەستا، توو دۆییێکمان خوارد زۆر بەلەزەت بو، جا ڕێکەوتین بۆ نیوەڕۆ گەیشتینە (خانەقای تەوێڵە).

لەوکاتا خانەقا پڕبوو لە خەڵکی موکریان، وەضعی عالەم لەبەر شەڕی عالەمی زۆر پەرێشان بوو، تەوێڵە مدرەسەی تیانەبو، جا لەبەر ئەمە لە تەوێڵە دەرچوین بۆ هەورامانی ئەودیو بۆ خانەقای (دوڕوو) بۆ مدرسەی مرحوم شێخ علاءالدین، کە لەو ڕۆژا سید حسین طائر بوغەیی لەوێ مدرس بو.

بەڕێگەی (تەتە)دا چوینە دەشتی (هەوش و بەدرانی) کە زۆر شوێنێکی بەصەفا و خۆشە، لەوکاتا حاجی شێخ عارفی سەقزی کوڕی حاجی شێخ مصطفی بە مهاجری ماڵی گەیشتبوە ئەو شوێنە، ئێمەش لامان دا ماڵی ئەوان قاوەڵتیمان کرد بە دەربەندی (کەلەوی) دا ڕاپەڕین بۆ عصرێکی دێر گەیشتینە (خانەقای دوڕوو).

کە گەیشتینە ئەوێ تماشامان کرد مدرسە پڕە لە طلبە هاتن بەدەم مانەوە اکرامیان گرتین، بەخزمەتی شێخ گەیشتین، زیارەت مان کرد، ئەویش بەخێرهاتنی لێکردین، بەخزمەتی سید حسینی مدرس گەیشتین. بە کورتی ئەوەندە دڵمان خۆش بو ئازاری سەفەرەکەمان نەما. (ل/64).

وە بەهۆی زۆری طلبە و بونی مدرسی بەرزی زانای وەکو سید حسینی طائر بوغی مکریانیەوە زۆر بە سەربەستی و دڵ خۆشی دەسمان بە خوێندن کرد، مامۆستا ملا عبداللطیف لە خزمەتی مدرسا جمع الجوامع ی ئەخوێند، منیش لە خزمەتی مامۆستا مەلا عبداللطیف دا سیوطی –م ئەخۆند..

بەکورتی ماوەی دوو مانگ زۆر بەخۆشی ڕامان بوارد، لەو ماوەدا شێخی علاالدین زۆر دڵی سید حسینی رائەگرت، بە حورمەت تماشای ئەکرد.

(پاش کێشەیەك کە ڕویدا)[1] سید حسین ئێوارە وەختێ بەتۆراوی لەدورو دەرچو ڕوی کردە هەورامان بۆ (تەوێڵە)

---

[1] کێشەکە بەدرێژی باسکراوە، کە لەنێوان سەید حسێن و وەکیل مەسرەفی شێخی عەلائەدین دا ڕوی داوە.. نەقلّم نەکردوە، بنوارە: ل/65.

لەوێوە ڕۆیشتەوە بۆ (مکریان) مدرسە بێ مدرس مایەوە.

ئێمەش سەرگەردان بوین، مامۆستا مەلا عبداللطیف یش لەدووڕوە بەرەو بانە گەڕایەوە، من و چەند طلبەیی بەبێ کەس ماینەوە بەدڵ پەرێشانی.

وا ئەم وەختە ناوەڕاستی پایزە، منیش بۆ وەضعی خوشکەکانم زۆر پەرێشانم ئەوانیش لەگەڵ خەڵکی ووڵاتا بە مهاجری هاتبون بۆ چەمی (ئەسکول و پیران)... لە هەواری (سەرشابکە) لەپشتی دەگاشێخانەوە کەپریان بەستوە، لەبەر ئەمە هەستام ڕۆیشتم بۆ ئەو شوێنانە بۆ لایان و فعلاً چاووم کەوت پێیان وەضعیان تاحدێ باش بو، بعزێ رزق و پارەیان بەدەستەوە مابو، پاش دوسێ ڕۆژ لەوێ گەڕامەوە بۆ دوروو، بەعزێ پارەم لەلایان هەبو مقداری دوصد قەرانم بۆ خەرجی خۆم هێنا لەگەڵ خۆما. تا من لەم سەفەرە هاتمەوە مەلا فیض‌الله ی طالش، کە مجازی ملا قادری صوّفی بو (ل/65) لە شمیرانەوە بەرەو دورو هاتبو بە عەزمی ئەوە بڕواتەوە بۆ طالش کە گەیشتبوە دورو، شێخ ئەمری فەرموبو لەوێ بمێنێتەوە، دەرز بە طلبەکان بفەرموێت تا مدرسێ ڕائەگرێ.

ئەم وەضعە تاحدێ دڵی ئێمەی خۆش کرد، طلبەکان دەستیان کرد بە دەرزخوێندن، منیش دەستم لە سیوطی هەڵگرت، دەستم کرد بە (إیساغوجی) لە علمی منطق. لەم کاتا ساڵ بو بە ساڵی (1336ك–1917ز)، دنیا ڕۆژ بەڕۆژ تاریك تر ئەبو رزق گران تر ئەبو، خەڵك لە هەمو شوێنێکەوە لەبەر بێ‌ڕزقی ماڵی خۆیان بەجێ ئەهێشت ڕو بە هەورامان ئەهاتن، چونکی ئەم هەورامانە لە ئازاری جەنگ پارێزراوبو، کەمێ رزق لە قبیلی تو میوە کەمێ دەخلی تیا دەست ئەکەوت.

بەڕاستی لەم زستانا شێخی دورو خوادا جەزای بداتەوە گەلێ خزمەتی موسڵمانانی کرد، نانەواخانەی دانابو، بۆ هەموو ڕێبوارێ ئێوارەو بەیانی نان و چێشت بوو، بۆ میوانی تایبەتی

یاسای پێشوو بەرقەرار بو، بۆ هەموو طالبێك ڕۆژی هەشت نان چێشت بڕیار درابو، بەتەواوی دەست ئەکەوت، ئێمە ئازاری برسێتی مان چاو پێنەکەوت، بە مەعلوماتی من لەو پایز و زستانا مقداری حەفتاوبینج تەغاری دورو بەراتی دا بە وخانە وادانە لێقە وماوانە کە پەنایان پێ هێنا، بە پارە یش بەقەی ئیمکان مساعدەی ئەکردن.

یەکێ لەوانە باباشێخی کوڕی شیخ عبدالله ی بانەیی بوو بەهەژدە سەرخیزانی خۆیو ماڵی مام و برازایەوە هاتبونە (دە یمە) یەو ڕۆژێ تەشریفی هات بۆ دورو بەخزمەت شێخ گەیشت پاش بەخێرهاتن إکرام، عەرزی شێخی کرد ئێمەکتێب خانەیێکی گەورەمان هەیە بۆمان دەرچوە تقدیمی شێخی ئەکەم بۆ مەدرە سە، وە شێخ لطف بکا بمان ژێنێ بەم مەعنا قیمەتی کتێبەکان رزقمان بێ بدا.

شێخ فەرموی: سەید عاجز مەبە خواکەریمە.

پاش نان خواردن نیوەڕۆ ئەمری فەرمو دوتەغارگەنم وزەڕات وەبیست تومان پارە وەعەبایێ وەجوتێ قۆندەرەیان تقدیمی بابا شێخ کرد، بەپیاوو ولاخی خۆیەوە بۆی ڕەوانەکرد، وەفەرمووی کتێبخانەی خۆیشتان موبارەکی خۆتان بێ.

لە ئاخری ئەم زستانا پورم فاطمة وەفاتی کردبو، جا (رابعە)ی خوشکم لەبەر بێ‌کەسی هات بۆ لام بۆ دورو، منیش قضیەکەم عەرزی شێخ کرد، شێخ زۆر بەمیهرەبانی فەرموی: هاتنەکەی زۆر باش بوە، انسان لە تەنگانەدا لەماڵی باوکی خۆیا بژی عەینی سەعادەتە، رابعە بەخۆشی لەماڵی شێخ دا دانیشت لە بەهارا امینەی خوشکم ئەویش هات بۆ لام، لەگەڵ رابعە دا دامەزرا، ئەم نەوعە پیاوەتی شێخە لەگەڵ ئێمەدا کردی مەگەر خودا جەزای بداتەوە، لەلاییێکەوە من بەخۆشی لە مدرسەکەدا ئەخوێنم، لەلایەکی ترەوە خوشکەکانیشم وەکو لەماڵی باوکیانا بن وەها ئەژیان، مع العلم باوکم مردیدێکی فدائی شێخ بو، خۆی وەصیەتی بۆ کردبوین کە هەر لە پەنای شێخ دابین، ئەو بەکارمان بێت، بالفعل وەها دەرچو.

پاش ماوەیێ شێخ ئەمری کرد رابعەم مارەکرد بۆ مەلا احمدی قارئ کە کوڕی رضاعی شێخ بوو، امنەیشم مارەکرد بۆ فقی موحەممەد کە مصرف وەکیلی اموراتی شێخ عثمانی کوڕی شێخ بوو، بەخۆشی دامەزران. (ل/66)

لە زستانی (1336ك-1917ز) گرانی گەیشتە پایەیێ مەنێ گەنم بەلیرەیێ زەرد دەست ئەكەوت، خەڵكی زۆر لە ڕێگەوبان و لاكۆڵانا مردن، گەلێ كەس لەكێوەكانا گیانیان دەرئەچو دڕندە گۆشتەكەی ئەخواردن، برا لەبرای نەدەپرسی، بەڵكو پەنا بەخودا باوك و دایك بیری ئەولادیان لەلا نەمابو...

بگەڕێینەوە سەر باسی مدرسە، لە بەهاری (1336ك) مامۆستا مەلا فیض‌الله ی طالشی ڕۆیشتەوە بۆ وولاتی خۆی، جا مامۆستا مەلا عارف امامی خانەقا، ئەو بو بە مامۆستای طلبە منیش لە منطق خوێندن دەستم هەڵگرت، هاتمەوە سەر خوێندنی سیوطی، ئەوەی مابو خوێندم تا نزیكی باسی (صرف)ەكەی، قضاءً مامۆستا مەلا عارف هەم ئەویش لە ئەوەڵی پایزا بەو نەخۆشیە كە باسم كرد[1] وەفاتی كرد، رحمه الله وطاب ثراه...(ل/67)

پاش وەفاتی مامۆستا مەلا عارف لە اخری پایزا لە برجی قوس دا شێخ ناردی بەشوێنی جنابی ملا سید محمد كوڕی سید امین گیزملی كە لە سنەدا لە خزمەتی مەلا حمەرشید بەگ مدرسی مزگەوتی (دار الاحسان)دا لە سنە اجازەی وەرگرتبو، هات بۆدوروو كردی بە مدرس لە خانەقای دوروودا...

جا لە خزمەتی مامۆستا سید محمدا ئەوەی لە سیوطی مابو تەواوم كرد، دەستم كرد بە رسالەی (رشدیە) لە علمی منطق دا كە كتێبێكی جوانە تالیفی مەلا محمد رشیدی مدرسی دار الاحسان بوو، پاش تەواوكردنی ئەم كتێبە دەستم كرد بە (فناری) لەپاش فناری دەستم كرد بە عبدالله یەزدی، خوێندنەكەم ڕەونەقێكی تازەی وەرگرت...(ل/68)(2[2])

بۆ ساڵی (1338ك-1919ز) مرحوم شێخ نورالدین، كوڕی مرحوم شێخ نجم الدین وەفاتی كرد، مرحوم مەولانا مەلا عبدالقادری مدرسی بیارەیش متوفی بو، بیارە بێ خاوەن مایەوە، جا شێخی بیارە یانی شێخ علاالدین لە ئاخری فەصلی بەهاری 1338 لەدورو گوێزایەوە بۆ بیارە گەلی هەورامانی ئەودیو، یانی دیوی شارەزور پێشوازیان لێكرد، مصطفی بەگی كوڕی جعفر سلطان بە امری باوكی هات بەپیرییەوە، لە خانەقای بیارە دامەزرا، لە هەمو لایێكەوە مرید و منسوب لە خواص و عوام ڕویان كردەوە خانەقای بیارە.(ل/70)

وە لەپاش ئەوە شێخ لە بیارە دامەزرا، مدرسەی دورووو هەرچەند هەر ئاوەدان بو، مرحوم مامۆستا سید محمد لەویا بە مدرس مابووەوە، بەڵام تقریبا چۆڵ بو، ئەو خۆشیەی نەما، لەبەر ئەمە منیش قەرارم دا بڕۆم بەو دیوا بۆ دەوری بیارە.

مع العلم من لەم بەینا زۆر استفادەم لە مامۆستا سید محمد كرد، عبدالله یزدی رسالەی ئادابی منظومة گەلەنبەوی ئاداب و عصام الدینی استعارە رشدیە و فناری بعزێ لە شەرح منهج رسالەی حسیبی فارسی و تشریح الأفلاك ئەمانەم هەمو بە دەرز خوێند، گەلێ لەمانەم لەبەر بو، لە خوێندنا چاوم تا حدێ كرایەوە...(ل/71)

لەم ماوەدا كەلەدورودا لەخزمەتی مامۆسادا ئەمخویند بەڕێكەوت چەن سەفەرێكی خۆش

كەوتە بەرم، یەكەم لەبەهاری ساڵی(1306ك-1888ز) لە اخری گرانیەكەدا لەدورەوە رۆیشتم بو(دەرەتفێ)بوو كڕینی گەلەنبەوی شەرح: لەم سەفەرا رویشتمە چور شەوێ لەوێ بوم، شەوێ لە(نێ) وەشەوێ لەدەرەتفێ بووم، كە گەرامەوە لە ڕێگەدا لەلای باخی تەرخانئاوا لەم دیوی بەئیلەوە گەیشتم بە مەرحوم محمد صالح بەگی كوری فەتاح بەگ، ئەم زاتە سوێندی خوارد لێم ئەبێ من سوار ئەسپەكەی ئەوبم ئەو بە پیادە لە پێشمەوە بڕوا، هەرچەند حەولمدا چارم نەكرد، بالفعل بەو شێوە لەگەڵیا هاتمەوە تاماڵەوە وەشەو لەسەربانی ماڵی حەمە سعید بەگی برایا نوستم، لەبەرەبەیانا بەم دەنگە خەبەرم بووەوە یەكێ ئەیووت: (إن أشرف خلق الله نور) مع العلم كەچاوم كردەوە نەكەس دیاربوو نەبانگیش درابوو، ئەم روداوە زۆردڵی روناك كردمەوە ،وەبەحاڵی إنشراحەوە هەستام نوێژی سبەینێم كرد وەلە پاش بەرقلیان وەچاخواردن

[1] لە ئەوەڵی ساڵی 1337ك لە نەخۆشیێكی وەكو ئەنفلۆنزەی ئێستە پەیدابو، گەلێ عالەم بەم ناساغیە مردن، دەوری دومانگ ئەم نەخۆشیە دەوامی كرد. ل/67، من ئەمەم پێشتر نەقڵ نەكردوە لەبەر درێژی.

[2] لە (ل/69-70) مامۆستای مودەرریس باسی گوندی دورو دەكات جوگرافیا و ئاوەكانی و جۆری گوڵەكانی و كێوەكانی چواردەوری و چۆنیەتی كڕینی لەلایەن شێخی علاوالدین دوە و خۆش ڕابواردنی قوتابیان تێیدا.

گەڕامەوە بۆ دوڕووە.

**سەفەری دووەم:** لەساڵی 1337ك– دا لە خزمەتی مامۆسا سید محمد شێخ عثمانی كوڕی شێخ گەڵێ پیاو مناسب قەرەباڵغ لە ڕێگەی كۆساڵان و ژیوارەوە هاتین بۆ هەورامانی ڕوی شارەزور بۆ دێی گولْپ بۆ ئەوەی كچی شێخ صادقی گولْپ خاتون حبیبە ناو بگوازینەوە بۆ شێخ مەولانای كوڕی شێخ.

لەم سەفەرا مەرحوم مەلا أمین ی جفاری مەشهورمان لەگەلا بو، شەویٚ لە ژیوار شەویٚ لە نوێن بوین، بەلای دێی كەلجی دا سەركەوتین، وەلە پشتی دێی هەجیجەوە داپەڕین بۆ چەمی هەجیج، بەڕاستی چونكی مەوسیمی بەهار (بو) ئەم سەفەرە زۆر بە صەفا بوو.

كە گەیشتینە سەر كێوی پشتی هەجیج مەلا أمین بانگی كرد: خەڵكە بێدەنگ بن بزانین ئەوە چی ئەڵێن، ئێمە هەمو داچڵەكاین، لامان كردەوە، پرسیمان چیە ؟! وتی ئەوە نیە كە مەلائكەكانی ئاسمان ئەڵێن (سبوح قدوس ربنا ورب الملائكە والروح) یانی شوێنەكە ئەوەندە بەرزە سەری داوە لە ئاسمان، كە لەو كێوە داپەڕین گەیشتینە شوێنێكی زۆر سەخت و نابار مەشهورە بە (چنگە ڕنە) یانی ئینسان دەست نەنێتە عەرز ناتوانیٚ داپەڕیٚ، مەلا ئەمین پرسی ئەمە كوێیە، وتیان لابەلای چنگەڕنە، وتی ئەم شوێنە قنگەڕنەیە نەك چنگەڕنە كە گەیشتینە چەم هەم مەلا ئەمین بانگی كرد بیٚ دەنگ بن دەنگی مەلائكەی عەزابی جهنم بێت، (ل/71) یانی ئەوەندە قوڵە نزیكی ژێر زەوی بوەتەوە كە وەكو مەشهورە دۆزەخ لە ژێر عەرزایە.

بە كورتی گەیشتینە باخەكانی خواری هەجیجەوە لەویا مەلا محمد ڕەشیدی هەجیجی لەویٚ بوو، شەو لەویٚ نانمان خوارد وەڕێكەوتین بۆ دێی (نۆدشە) شەو لە نۆدشە بوین، بۆ سبەینیٚ هاتین بۆ دێی تەوێڵە شەویٚ لەماڵی محمد رشید ئاغای كوڕی سعید ئاغای خاڵۆی شێخ بوین، سبەینیٚ زیارەتی مەرەدی سراج الدین و بهاءالدین مان كرد، جاڕێكەوتین بۆ بیارە، وەشەویٚ لە بیارە بوین، زیارەتی مەرقەدی ضیاء الدین نجم الدین زیارەتی مەحاسنی شەریفەمان كرد.

وە زیارەتی مەولانا مەلا عبد القادر مان كرد زۆر إكرامی شێخ عثمان و سید محمدی گرت، وەمن دەستم زیارەت كرد دوعای توفیقی بۆ كردم، بۆ سبەینیٚ ڕۆیشتین بۆ گولْپ، شەویٚ دوو شەو لەویٚ بوین، جا بوكیان سوار كرد، ئەمجار بە ڕێگەی سەرگەتا بە كێوی كەماجارا هاتینە سەر بە ڕوی (قەلاٚخانی) و (هەوش و بەدرانی) دا، وەشەو لە ( دەرەكیٚ ) لەماڵی أسعد بەگی كوڕی بورزۆ بەگ بوین، بۆ سبەینیٚ بە ڕێگەی دەربەند، كە لەوێدا ڕۆیشتین بۆ دوڕوە نزیكی عەصر گەیشتینە بەرابەری دوڕو، تماشامان كرد سوارە مەشغوڵی ڕمبازین، وەشێخ نظام الدین برای شێخ كە زۆر سوارچاك بووهات بە پیرمانەوە، لە عەینی وەختا گەلەبەكانی خانەقایش پاشایان دروست كردبو گەلیٚ سەیر و صەفامان لەو كاتا چاو پێكەوت.

**سەفەری سێهەم:** لە ئاخری بەهاری (1338ك–1919ز) لە زەمانی حوكمداری شریف الدولە عصای ( ) ناردبوو بە خەلاٚت بۆ شێخ، ئەمریٚ لە سنەوە هاتبو كە شێخ بڕوا بۆ سنە ئەو خەلاٚتە وەربگریٚ، بەلاٚم شێخ وای بە مەصلەحەت زانی كە سید محمدی مودەڕڕیس، وەشێخ عیمانی كوڕی، وەحاجی میرزا رحمت الله ی طالش بنێریٚ بۆ وەرگرتنی، بالفعل ئەمانە ڕێكەوتن، منیش لە خزمەت مامۆسا سید محمدا ڕێكەوتم، لەم سەفەرا شەویٚ لە سور كەوول، وەشەویٚ لە (شوێشە) بوین، بۆ سبەینیٚ ڕۆیشتین بۆ سنە تانزیكی دێی (كەمیزن)، دەوری دووصەد سواریٚ لە أعیان و علماو مەنسوبین هاتن بە إستقبالی شێخ عیمانەوە، وەڕۆیشتین لە مزگەوتی مەلا محمد ی كوڕی مەلا عارف ی كوڕی مەلای نودشە، كە عائدی ماڵی حاجی معتمد بو دابەزین.

ئەم ورودی ئێمە تصادفی ئەوەڵی ڕەمەزانی كرد، چواردە ڕۆژ لەویٚ ماینەوە، حەفلەی وەرگرتنی (عصا) بەسرا، لەم حەفلەدا ناطقی لەسەر ئایەتی (هل يستوي الذين يعلمون والذين لايعلمون) بە تەشریفی علماو زانا و ڕۆحیانیان دا گەلیٚ قسەی جوانی كرد، جا شەربەت خۆری كرا، لەم مەجلیسا بە خزمەتی مەرحوم مەلا عبد الله ی موفتی وشەیی وەسید نجمالدین

كوڕی سید عبدالحكیم هەمرولەیی گەڵ علمای بەرز گەیشتم، لەم سەفەرا شەوێ مەدعو بوین لە ماڵی حاجی معتمدا، میرزا عبد الله خان بەعزێ پرسیاری عیلمی لە من كرد، جوابم دایەوە، لە بیستنی ئەم سوال و جوابە حاجی معتمد زۆر مەسرور بوبو، كاتێ ئەهات بۆ مزگەوت بۆ چاو پێكەوتنی شێخ عثمان ئەی پرسی ( ئاغەی مەللای محقق لە كوێیە ) بەم عنوانە خەبەری منی ئەپرسی میهرەبانی دەرئەبڕی. (ل/72)

لەو سەرەوە كە هاتینەوە شەوێ لە دێی (كەرچو) شەوێ لەدێی (نجنی) لە خواری دێی (ئەویهەنگ)ەوە بوین، بۆ شەوی سێهەم گەیشتینەوە دوڕوە.

**سەفەری چوارەم:** لەم ساڵا لە زستانا لە خزمەتی شێخ دا ڕۆیشتم بۆ دێی (سورەتو)...

**سەفەری پێنجەم:** خۆم لەگەڵ بەعزێ قوتابی ڕەفیقما چەن ڕۆژێ بۆ ڕابواردن ڕۆیشتین بۆ ژاوەرۆ، وەخت پایز بو، هەمو نەوعە میوەیێ وەكو قۆخ و هەرمێ و هەنار، وەكەمێ ترێ مابو، لەم سەفەرا كە گەڕاینەوە لە چەمی (بوری دەر)ا تاقە دانەیێ (بەهێ)مان بەر دارێكەوە چاوكرد، من بڕوم تێگرت داكەوت، كەچوم بەهێكە دەربێنم دارێكم بۆ درێژ كرد بە هێیەتر دەركەوت، تەكرار بەهێی تر دەركەوت هەتا صدو چل دانە بەیمان لەو ناو بێشەو باخە دەركرد كە إعراضیان لێنابو، بەخۆشی و ڕابواردن هاتینەوە...

بڕۆینەوە سەر مەقسود، پاش ماوەیێ لە دامەزرانی شێخ لە بیارە لە ڕۆژی سێشەنبە (7)ی مانگی ذی القعدة لە ساڵی (1338ك–1919ز) لەگەڵ سید فرج ی عەربەتی دا كە ئەویش لە طلبە ی علم بو، دوورومان بەجێهێشت، ڕۆیشتین بۆ بیارە، بۆ شەو گەیشتینە بیارە، بە خزمەتی شێخ گەیشتین، بەڵام لەبەر ئەوە كە لەو كاتا لەبیارەدا مدرسە نەبو، شێخ نامەی بۆ نوسین بۆ خزمەتی مامۆستا مەلا حمەسعیدی مدرسی (عەبابەیلێ) بالفعل ڕۆیشتین بۆ ئەوێ دامەزراین، من دەرسی گەلەنبەوی بورهانم ئەخوێند لە ئەوەلیەوە، پاش ئەوە كە چەند دەرسێكم لێ خوێند گەیشتم بە باسی (نسب ی اربعە)، مامۆسا مەلا حمەسعید سەفەری شاری سنەی كەوتە بەر ڕۆیشت، تا ئەو لەو سەفەرە هاتەوە من بۆ دەرس ئەڕۆیشتمە هەڵەبجە لە خزمەتی شێخ بابا رسول ی بیدەنی كە لەو دەما میوانی ماڵی شێخ عبداللطیف بو، دوازدە دەرزم لەگەلەنبەوی خوێند... (ل/73)

تماشام ئەكرد وەضعی خوێندنمان لە عەبابەیلێ باش نیە، چونكی دەرزمان ئەفەوتا، لەبەر ئەمە لەگەڵ سید فەرەج دا لە سێ شەنبەی حەوتی مانگی محرمی (1339ك1920ز) گەڕامەوە بۆ هەورامانی ئەودیو، سید فرج لەدێی (ئەلمانە) لەخزمەتی باباشێخ دامەزرا منیش ڕۆیشتمەوە بۆ دوڕوە. لەخزمەتی مامۆستا سید محمدا دامەزرامەوە، من لەماوەی پایز و زستان و بەهارا لە خانەقای دوروە گەلەنبەوی بورهانم خوێند.

وە لە هاوینی ساڵی (1339ك–1920ز) ڕۆژی شەمەی بیست هەمی مانگی شەوال لە خانەقای دوڕوە ڕۆیشتم بۆ مدرسەی (بالك) بۆ خزمەتی مەلا محمودی جوانڕۆیی، لەوێ دەستم كرد بە شرحی عقایدی ملا سعد گەیاندمە باسی (تكوین) لە اخری صفاتی ذاتیەدا، فرائضی منظومەی شێخ معروفی نودێشم لەخزمەتیا تەواوكرد.

لەم ماوەدا شێخی بیارە هات بۆ مەریوان...(ل/74) لەم سەفەرا لەو سەرەوە شێخ تشریفی هێنا بۆ (بالك) ئێمەش تا نزیكی بەرقەڵا، لەگەڵ اشراف و پیاو مناسبی دێ، مامۆستا مەلا محمود استقبالمان كرد، كە تشریفی هاتە بالك شەوێ لە بالك مایەوە سبەینێ تشریفی ڕۆیشت بۆ چور، ئێمەش هەموو لایێ تا چور بۆ ڕەوانەكردنی ڕۆیشتین، لەم ماوەدا شێخ فەرموی بە من كە ملا احمدی ڕەش لەبیارەیە ئەمەوێ بیكەم بە مدرسی خانەقای بیارە، ئەگەر مەیلت هەیە تۆیش بێرەوە بۆ بیارە بۆ خوێندن، منیش لەسەر ئەم ئەمری شێخە، ڕۆژی جەژنی قوربان لە (1339ك) لەدێی بالك ەوە گوێزامەوە بۆ بیارە، لە بیارەدا لە خزمەتی مامۆستا مەلا احمدی ڕەش دا بە فەقێ تی دامەزرام.

لەماوەی سێ مانگا لە خزمەتی مامۆستا مەلا ئەحمدا شرحی عقایدم تەواوكرد، عقیدە كوردییەكەی مەولەوی‌م بە دەرز خوێند. دەستم كرد بە مختصری مطول، گەیاندمە سەر بابی احوالی مسند إلیە، لەم مدەدا شێخ توفیقی پشتەیی كوڕی

شێخ عبدالرحمن ئەویش لە بیارەدا لە خزمەتی مامۆستا شێخ حیدرا، دەرزی کافیەی ئەخوێند، من لەگەڵیا خەریك ئەبوم تا باش ڕەوانی ئەکرد.

مامۆستا مەلا احمد لە بیارەدا زۆر پەرێشان بو مەترسی بو لە بەعزێ دەستەو بەستەی مەلا حسین کە ئازاری بدەن، هەرچەند شێخ دڵ خۆشی ئەدایەوە سودی نەبو، لە ئەنجاما ئیزنی وەرگرت لەشێخ، کەوتە ڕێ بۆ شاری سلێمانی، منیش ناچار لە خزمەتیا ڕێکەوتم، مەلا عەلی مەولاناوایی کە ئێستە مەلای (فقێ جنە)یە[1] ئەویش مان لەگەلا هات بۆ سلێمانی بۆ ئێوارە بەزەحمەت گەیشتینە دێی (مووان) چونکی لەو ڕۆژا لەخەتی سید صادقەوە ئوتومبێل نەبو، ئێوارە وەختێ درەنگ گەیشتینە ناو دێ، بوین بە میوانی امامی ئەو دێ کە ناوی مەلا کریم بو، خەڵکی ئەو ژورە بو، تماشام کرد مەشغولی جەژنی مولودە، نان و چێشتێکی زۆری دروست کردوە، ئێمەش ئەو شەو مەولودنامەکەمان بۆ خوێندنەوە، بە زەوق و شەوقێکی باش جەژنەکەمان تەواوکرد.

سبەینێ ڕێکەوتین بۆ ئێوارە گەیشتینە شاری سلێمانی لە خانەقای حەزرەتی (مەولانا خالد) (قدس الله سره) کە لەو سەردەما مامۆستا شێخ عمری ابن القرداغی مدرسی ئەوێ بو بە میوانی دانیشتین، پاش دوسێ ڕۆژ مامۆستا شێخ عمر زۆر میهرەبانی لەگەڵ منا کرد، بەصورەتی فەقێتی لەخزمەتیا دامەزرام، مامۆستا مەلا ئەحمەدیش لەسەر توسطی مامۆستا شێخ عمر رحمه الله بو بە مدرسی (گەلاڵە) لە ناحیەی ماوەت... (ل/75)[2]

لەساڵی 1340ك–1921ز دا کە دامەزرام لە خزمەتی مرحوم مامۆستا شێخ عمر رحمه الله تعالی، بەهۆی کۆشش و رەغبەتی ئەوا لە خوێندن و کتابت و اشتغال بە علم ئافاقێکی تر لەبەرچاومانا کرایەوە، ماوەیێ هەر مەشغولی خوێندنی مختصر بوم. پاش ئەوە کتێبی ( أقصی الأماني ) کە تالیفی حفیدی سعدی تفتازانییە مامۆستا شێخ عمر حاشیەی لەسەر کردوە، بە حاشیەکانەوە نوسیمەوە بە دەرس خوێندم، جا دەستم کرد بە خوێندنی ریاضیات ترشیح الأفلاك و رسالة حسابی (ل/77) بهاء الدين عاملي،وە اسطرلاب تالیفی عاملي بعضی لە ربعی مجیب م بەدەرز خوێند، ئەم کتێبانە هەموو مُدوّنی مامۆستا شێخ عمریان لەسەرە، پاش ئەمانە تقریب المرام شرحی تهذیب الکلام بە حاشیەی شێخ، حاشیەی مەلای پێنجوێنەوە نوسیمەوە، ماوەی هەشت مانگ مەشغوڵی بوم خوێندم، کتێبی (جمع الجوامع) م بە خط لەگەڵ مدونی مامۆستا شێخ عمرا نوسیەوە، خوێندم، گەلێ منهج تحفەم بە دەرز خوێند، بەدەم ئەمانەوە فریدەی جلالی سیوطی م نوسیەوە، سماعم کرد، گەلێ إستفادەی زیادم لەشێخ کرد گەلێ میهرەبانی و لطفی لەگەڵ ما بو خودا پایەی بەرز بکا.

## بۆ یاداشت[3]

لەوکاتا گەیشتمە سەر باسی ( إلهیات ) لە تقریب المرام وەضعی سلێمانی تێکچوو، لەبەر ئەوە لەو چەرخا شێخ محمودی حفید زادە کرابو بە سەرۆك و فەرەمانڕەوای ئەو ووڵاتە، میانەی لەگەڵ حکومەتی عێراقدا تێکچو، شاری سلێمانی کەوتە بەر (بۆمبابارا‌ن) خەڵکی شار وڵاتەکەیان چۆڵ کرد، جا من و مەلا عبدالقادری خۆشناوی (بالیسانی) بەیەکەوە رۆیشتین بۆ (عەبابەیلێ) و لە خزمەتی مامۆستا حمە سعیدا دانیشتین، من دەستم کرد بە (لب الأصول) سێ مانگ لە هاوینا لەوێ مامەوە هەتا وەضعي شار باش بوو، جا گەڕاینەوە بۆ شار لە خانەقادا دانیشتینەوە ئەو مقدارە کەمابو لە تقریب المرام تەواوم کرد، پاش ئەو کتێبە حاشیەی (لاری)م خوێند.

لەم ماوەدا لە سلێمانی ئەو مستعدانە کە بەیەکەوە لە خزمەتی شێخ دا ئەمان خوێند ئەمانە بون:

---

[1] ئەم نوسراوە لە شەستەکاندا مامۆستای مدرس نوسیویەتی و ئەوکاتە مەلا عەلی لە (فقی جنە) بووە.

[2] لێرەدا مامۆستای مدرس بەدرێژی باسی ژیاننامەی (مەلا احمدی رەش) دەکات، بنوارە ل/75–77.

[3] ئەم سەرباسە هی مامۆستای مدرسە، بنوارە ل/78، بەلام جیای نەکردوەتەوەو بەم چەشنە نوسیویەتی: (بۆ یاداشت: لەوکاتا..).

1–سید عبدالحكیم.. 2–مەلا حسینی كوڕی عبداللە ی خسرو چاوەش خاڵۆزای شێخ تاج الدین خەڵكی دێی (گوڵپ).. 3–مەلا حممد امین ئەسپەرێزی هەورامی.. 4–مەلا یحیی كوڕی مەلا محمودی كوی حاجی مەلا سلامی بانەیی.. (ل/78) 5– مەلا عنایت اللە.. 6– شێخ محمدی خاڵ..[1]

## ئیجازە وەرگرتنی مامۆستای مودەڕڕیس و نەرگسەجار

من خۆم لەپێش كاتی اجازە وەرگرتنم یەك دوو جار لە بیارە غیری بیارەدا ملاقاتی شێخ صدیقی كوڕی شێخ معروفی نەرگسەجاریم كرد، بەیەكەوە رێكەوتین لەسەر ئەوە پاش اجازە وەرگرتن بڕۆم لە (نەرگسەجار) بە مدرس دابنیشم لەبەر چەند شت ئەم وەضعەم قبوڵ كرد:

یەكەم: نەرگسەجار لە زەمانێكی سابقەوە مدرسە بوە، كتێب خانەیێكی باشیان هەبوو.

دوهەم: شێخ صدیق منسوبی شێخی بیارە بو، لەگەڵ منا هاو مەشرەب بو.

سێهەم: نزیكی بیارە بو، هەركاتێ بم ویستایێ بڕۆم بۆ زیارەتی شێخ لە بیارەدا بۆم ڕێ ئەكەوت.

چوارەم: ئەو بە وەەزعێكی وا دەعوەتی منی كرد كە بەیەكەوە وەكو برا بژین.

سەرەڕای ئەمانە شێخی بیارەش لەسەر ئەم وەضعە ڕاضی بو. تەرغیبی كردم بۆقبولی اقتراحی شێخ صدیق، مامۆستا شێخ عمریش تصویبی ئەمەی فەرمو.

جا لەمانگی شعبان لە موسمی ئەوەڵی بەهاری تاریخی 1343ك–1924ز مامۆستا شێخ عمر رحمە اللە بانگی كردم، فەرموی: كاتی ئەوە هاتووە إجازەی تدریس بدەم پێت، بڕۆی تدریس بكەی، انشااللە موفق ئەبی، بە تدریسی طلبة گەلێ تەرەقی ئەكەی.

جا بەدەستی خۆی اجازەنامەی بۆ نوسیمەوە لە بختیاری منەوە لەوكاتا جەنابی مرحوم شێخ نجیبی قەرەداغی كە ئوستادی ئوستادم بو لە سلێمانیدا بو، جا جنابی شێخ نجیب و شێخ بابا علی و ملا حسینی پیسكەندی و شێخ معروف برای شێخ عمر گەلێ لە اهلی علم، مستعدی مزگەوتەكان حاضر بوون، شەربەتیان خواردەوە شێخ باباعلی اجازەنامەكەمی خوێندەوە، سید بلالی خەڵكی (شابەدین) كە لە نەتەوەی مەلا موسای توكلی یە، هەستا مێزەرەكەی بەست بەسەرمەوە منیش یەكەیەكە دەستی مامۆستاكانم زیارەت كرد، هەموو دوعای توفیقیان بۆ كردم. لەم مجلسە پیرۆزە پڕ لە علمای كبار طلبەی علومە إجازەم وەرگرت جبە و عەمامەم بەبەرما كرد. (ل/79)[2].

جا پاش اجازە وەرگرتنم لە دوازدەهەمی مانگی شعبان دا لە ساڵی 1343ك لە شاری سلێمانیەوە ڕوو بە هەڵەبجە ڕێكەوتم بۆ نەرگسەجار ملا عبدالقادری خۆشناوی بالیسانی كە لە مزگەوتی شێخ محمد بەرزنجی دا ئەی خوێند و قاضی میری ئەخوێند، بە حسنی ظنی بەمن لەگەڵما هات.. (ل/93) بە قەسدی ئەوە لەلام بخوێنێ، هەروا مەلا محمدی كوڕی صوفی كریم بەگی مەریوانی خەڵكی (نێ) ئەویش هات ڕۆیشتین بۆ هەڵەبجە، لە هەڵەبجەدا لە مزگەوتی پاشا بوین بە (میوان) جا ڕام سپارد تا لەدێی نەرگسەجارەوە، ملا امینی كوڕی دەرویش عبدالرحیم وولاغی سواری بۆ خۆم وولاغی سواری بۆ أسبابەكانم هێنا ڕۆیشتین بۆ (نەرگسەجاڕ) لەوێ شێخەكان ئەهلی دێ هاتن بە استقبالمانەوە، بۆ حورمەت دابەزیم، بە صفەتی مدرس امام لەدێ دامەزرام، دڵ خۆشییەكی زۆریان دامەوە بە نەوعێ كە ئەو شوێنەم بە ماڵی خۆم

[1] مامۆستای مدرس، هەر یەك لە مستعدەكانی هاوەڵی كورتەژیانێكیان بۆ دەنوسێ، تەنها شێخ محمدی خاڵ نەبێ، كە دەفەرموێ: لەمەولا باسی ئەكەم، بنوارە ل/78–79. وەلێ من بەكورتی تەنها ناوەكانم نقڵ كردوە.

[2] ل/80 نامەیەكی شێخی عەلائەدینە، ل (81 ـ 83) ئیجازە نامەكەی مامۆستای مودەڕیسە، بنوارە پاشكۆی ئەم كتێبە، ل 84–92 باسی شێخ عمر ابن القرەداغی یە و دواتریش باسی سەفەرێكە كە مامۆستای مدرس پێش اجازە وەرگرتنی نەرگسەجاری بینیوە. ل/93.

ئەزانی..[1]، بەهۆی خزمەتی منسوبینی اطرافەوە رابواردنمان باش بو، طلبەکان لەلایەن ماڵی شێخ صدیقەوە، ماڵی شێخ قادر شێخ احمدی مامی شێخ صدیقەوە خزمەت ئەکران.

وە منیش بەتایبەتی لەماڵی شێخ صدیقەوە خزمەتم ئەکرا، بەیانی و ئێوارە نانم بۆ ئەهات تا ماوەی چەند مانگێ بەم نەوعە رام بوارد، لەپاش ئەوە مەیلم لەسەر ئەوە بو کە ژن بێنم، خۆم جێگە و ڕێگەیێکی تایبەتیم ببێ لەم خصوصە استشارەم بە شێخی بیارە کرد، ئەویش فەرموی صبر بکە بەڵکو لەلاییێکەوە کەسێ هەڵکەوێ کچێکی باشی ببێ مارەی بکەی. (ل/95)

پاش ماوەیێ لەم پرسیار و راوێژکردنی منە بەشێخ، مەلا ئەحمەدی زاوام لە دورەوە هاتبوو بۆ بیارە بۆ خزمەتی شێخ، لەوێ باسی مەسئەلەی ژهێنانی بۆ من کردبو، قەراریان دابو کە خوشکی مەلا ئەحمەد مارەبکەن بۆم لەسەر ئەو قرارە شێخ بە خطی خۆی ئەم کاغەزەی بۆ من نوسی بۆ نەرگسەجار[2].

منیش پاش هاتنی نامەکە رۆیشتم بۆ بیارە، لەوێ لەبەر چەند دەلیلێ ئەم مطلبەم رفض کرد هاتمەوە بۆ نەرگسەجار.

لە هاوینی ساڵی 1344ك–1925زدا لە کاتێکا کە لە هەواری نەرگسەجارە کۆذا بوین، بیستم شێخی بیارە رۆیشتوە بۆ ئەوبەری سیروان لە نزیکی (پەلکژی)[3]دا کەپریان بۆ بەستوە.. منیش لەگەڵ فەقێکان بەعزمی زیارەت رۆیشتین بۆ خزمەتی شێخ بۆ ئێوارە گەیشتینە کانی کەوە، لەماڵی محمدی سان احمد میوان بوین، هەر ئەو شەوە، ولاغی سواری بۆ هێنام پیاوێ شارەزای لەگەڵ منا نارد هەتا گەیشتینە هەواری (پەلکژی) شەو لەوێ نوستین بۆ سبەینێ بە خزمەتی شێخ گەیشتین، بەڕاستی ئەم هەوارە زۆر خۆش و فێنك بو... (ل/96)[4].

ئێمەش لەبەر ئەوە قەرەباڵغ بوین کەپرێکیان بۆ بەستین، فەقێکان دەرزیان ئەخوێند مەشغول بوون، تقریبا حەفتەیێ لەوێ ماینەوە.

لەو ماوەدا مەلا عبدالله ی مەلای محمد بەگی حبیب الله خان مەشهور بە امیر اسعد لە طرفی محمد بەگەوە بۆ بەعزێ ئیش هات بۆ خزمەتی شێخ، کە چاوی کەوت بەمن فەقێکان وا مەشغوڵی خوێندن و دەرزین، دڵی یێتە سەر ئەوە کچی خۆی بدا بەمن، ئەڕوا لەخزمەتی شێخ ئەم مەقسەدەی عەرز ئەکا، جا شێخ ناردی فەرموی مەلا عبدالله بە زمانی خۆی ئەڵێ من طالبی ئەوەم کچێکم هەیە مارەی بکەم بۆ مەلا عبدالکریم، تۆ چی ئەڵێیت، منیش عەرزم کرد قوربان جارێ من ئەو کچەم نەدیوە، نازانم وەضعی چۆنە، شوێنەکەیشیان دورە لە نەرگسەجارەوە، جا ئەمری شێخە.

شێخ فەرموی: من وەضعی ئەزانم مناسبە، دوریش مانع نییە، بەڵکو باشترە لەنزیکی بۆ ئەم زەمانە، من مەیلم وایە مارەی بکەی، شێخ ئەمری فەرموو شەربەت خۆرییان کرد، مەلا حسینی کوڕی مرحوم مەلای گەورە لەوێ حازر بو، مەلا عبدالله کچەکەی بۆ مارەکردم، پاش ئەم وەضعە بە دوسێ رۆژ مەلا عەبدوڵلا رۆیشتەوە، ئێمەش گەڕاینەوە بۆ نەرگسەجار لەسەر ئەم قەرارە کە تا پاییز ئەسبابی زەماوەند ئامادە بکەم، بنێرم بەشوێنی ژنا بۆم بێت.

وە فعلا هاتمەوە بۆ نەرگسەجار اسبابم رێکخست لە ئەوەلی پایزا شێخەکانی نەرگسەجار شێخ احمدی شێخ عبدالرحمن، شێخ علی شێخ عارف لەگەڵ چەند کەسێکا سوار بوون، لە ساداتی تاوەگۆزی نەتەوەی مەولەوی جەنابی سید محمودیشیان لەگەڵ خۆیانا بردبو (ل/99)، رۆیشتبون بۆ ماڵی کوێخا محمودی کوڕی کوێخا احمدی کوێخا یوسف لە (ئەشکی) لەوێوە چوبون بۆ (قالیچەکە) کە هەوارگەی زستانی محمد بەگی میر اسعد بو، لەوێوە عائلەکەیان بۆ

[1] لێرەدا (نامی) باسی شێخەکانی نەرگسەجار و قسەووتنێکی بە (ابوطالب) نوسەری حاشیەی سیوطی و خەوبینێن پێیەوە دەگێڕێتەوە من نەقڵم نەکردوە. بنوارە ل/94–95.

[2] نامەکەی شێخ لە ل/96.

[3] کانی و ئاوێکە لە نزیکی کێوی (کەرگەمل) لە پشتی دێی (مورتکە)ی سید کاك احمدەوە، بنوارە ل/96.

[4] لە ل/97–98 چوار نامەی دەستخەتی شێخ عمر بن القرداغی.

گوێزامەوە بۆ نەرگسەجار، خودا جەزایان بداتەوە قەدرێ زەحمەتیان كێشابو بۆ من...

لە بەهاری 1345ك–1926زدا شێخ لە بیارەوە شێخ فاضلی كوڕی شێخ محمودی شێخ محمد صالحی (گۆپ تەپە)یی نارد بۆ لام بۆ خوێندن... ئەم شێخ فاضلە لەو رۆژا (عبدالله یەزدی) ئەخوێند انسانێكی زۆر خاوەن استعداد و قابلیەت وسیماجوان و خط خۆش دەنگ خۆش بو، گەلێ مرید و منسوبیان لەدێ (غولامی)دا هەبوو، هاتنی ئەو هەم بو بەهۆی رەغبەتی خەلك لە خزمەتی مدرەسەكەمانا... (ل/100)

لەساڵی 1345ك دا لە پشتی خانوی شێخ صدیقەوە خانوێكیان پێدام، بەلاّم لەبەر ئەوە شوێنەكە كفایەتی نەدەكرد، لەبەردەمی ئەو خانوا سەكۆیێكم دروست كرد و هۆدیەیێكی باشم بۆ خۆم دروست كرد، بەلاّم گەلێ ئازاری دڵم بو چونكی داری ئەم خانوە لەدێی (تەوقوت) بران بە ئاوی تانجەڕۆدا هات تا نزیكە نەرگسەجار، لەویا مەلەوان دارەكەیان هێنا دەرەوە ئەوسا بە لۆس خەڵكی نەرگسەجار هێنایان بۆ ناودێ، هەرچی قامیشی پێویست بو هەموی خەڵكی شەكەرمەیدان مەمەشەیی بە ولاّغی خۆیان بۆیان هێنام.

بەم نەوعە شوێنی سكونەت تەواو بو، هەم بەقەی پێویستی دۆ و رۆنی خۆمان، حەیوانی وردە وەكو بزن و مەڕ مانگا بەدەستم كەوت، قادری سلیم نیوەی جوانی ماینێكی پێدام بۆ سواری، ڕەشوەی دایە دەستم، بەكورتی لە خصوصی گوزەرانەوە لە هەمو بابەتێكەوە وضعم باش بوو، رۆژ بەڕۆژ خەڵك زیاتر ئەیان ناسیم ئولفەتیان لەگەڵما پەیدا ئەكرد بە نەوعێكی وەها پیاوێكی مورشد و مقتدی بە رعایەتی دڵ یان ئەكردم.

وە خەڵكی شەك مەیدان مامەشەیی بەش پیرك قارەمانی هەموو وەك و مرید و منسوب رعایەتی دڵ یان ئەكردم، ئەوەی كە هۆی ئازاری دڵم بو ئەوەبو بەهۆی گەرمی شوێنەكەوە، هەمو ساڵا چاووم ئەئێشا، بەناچاری ئەبو كاتی هاوین بڕۆیشتمایە بۆ بیارە، ماوەی چل رۆژێ لەوێ بمێنمەوە.

لەم خصوصەوە دڵم نارەحەت بو لەلاییێكەوە وەضعی تدریس احترامی خۆم و طلبەكانم زۆر باش بو، لەلاییێكەوە گیرۆدەی چاوئێشە بوبوم هەمو ساڵێك جارێك و دوجار چاوم ئەیێشان، ترسم بو چاوم عەیب دار بێن.

بەهەر حاڵ صەبرم كرد بە ئومێدی ئەوە خودا دەروویێ بكاتەوە لێم، لە شوێنی خۆما مەشغوڵی تدریس بوم، هەر لەم ساڵی 1345ك–1926ز دا لە شەوی جمعەی سێهەمی مانگی رجب المفردا (فاتح) لەدایك بو، لەوكاتا گەلێ طلبەی باش لەلام بون، یەكێ لەوان مەلا محمدی كوڕی دەروێش كریم كوڕی رحمانی قازی خزمی خۆم بو، كە لەو رۆژا نەم ئەزانی خزمایەتیمان هەیە...

وە لەم نەرگسەجارا وەكو تدریسم ئەكرد، جارجار لەكاتی فەراغەتا ئەو شەرحەی كە لە (صمدیە)م كردبو لە زەمانی فەقێتیما لە سلێمانیدا بە ناقسی مابوەوە لێم ئەنوسی لە ئەنجاما كەمێكی مابو لە زستانا رۆیشتم بۆ بیارە لەوێ ئەو مقدارەم تەواو كرد.

لە بەهاری ساڵی 1346ك–1927ز قصیدەییێكم لە مدحی حضررەتا صلى الله علیه وسلم نوسی، هەروا لەلام مایەوە تا لەساڵی 1355ك–1936زدا بە عنوانی (نور الصباح) لە چاپخانەی محمد امین عصری دا لە كركوكا چاپ كرا ولله الحمد... (ل/103).

لە موسمی هاوینا لە ئەوەڵی ساڵی 1345ك–1926ز شێخ عبداللطیف قازی لە هەڵەبجە نەخۆش كەوت، ئێمەیش لە نەرگسەجار بیستمان كە شێخی بیارە هاتووە بۆ عیادەی شێخ عبداللطیف، بە عەزمی عیادەی شێخ عبداللطیف زیارەتی شێخ رۆیشتین بۆ هەڵەبجە دوو شەو لەوێ بوین، شێخ عبدالطیف زۆر ناساغ بو، بەلاّم لەبەر قەرەباڵغی زۆر بە مصلحەتمان زانی بگەڕێینەوە بۆ نەرگسەجار و فعلا خواحافظیمان كرد هاتینەوە بۆ نەرگسەجار، بۆ سبەینێ لەپێش نیوەڕۆدا نوستم، لە خەوما یەكێ هات وتی شیطانی نمرود لەگەڵ ابراهیم عبداللطیف مجادلەی كرد، بەلاّم ابراهیم عبداللطیف غالب بو بەسەریا، كە خەبەرم بووەوە تێگەشتم كە شێخ عبداللطیف وەفاتی كردوە، فعلاً بۆ ئێوارە بیستمان ئەو رۆژە وەفاتی

كردوه، دوباره رۆیشتینەوه بۆ تعزیە فاتحە خوێندن. رحمە الله وطاب ثراه وجعل الجنة مأواه...

بۆ ساڵی دوایی كە تاریخ گەیشتە 1346ك–1937ز لە پایزا مرحوم مامۆستا مەلا حمەسعیدی عەبابەیلیٚ یش وەفاتی كرد، دوو رۆژ لەپێش وەفاتیا هەر ئەمەی ئەخوێند (الله لطیف بعباده). مرحوم شێخ عبداللطیف لە گۆڕستانی مەشهور بە گولاٚن لە هەڵەبجە دفن كراوه، مەرحوم مامۆستا مەلا محمد سعید لە شمالی غەربی مەرقەدی حضرەتی اباعبیده بەدوازدە هەنگاو دفن كراوه. طاب ثراهم وجعل الله الفردوس مأواهم بفضله آمین.

## دامەزرانی مامۆستای مودەڕڕیس لە بیارەدا

بڕۆمەوە سەر باسی خۆم، لە ایام تشریقی ساڵی 1346ك لە بیارەوە نامەیێكیان نوسی بو بە شوێنما بۆ نەرگسەجار كە بڕۆم بۆ بیارە منیش رۆیشتم، كاتێ گەیشتمە بیارە حاڵییان كردم كە شێخی بیارە بڕیاری داوە: سید موحەممەد مدرسی خانەقای دوروه بهێنێ بۆ بیارە بیكا بە مدرس، منیش ڕەوانە بكا بۆ خانەقای دوروه، لەوێ بە مدرس دابنێشم، داوای موافقەیان لێكردم، منیش لەبەر ئەو عوزری چاوئێشەو گەرمای نەرگسەجارە موافقەم كرد، لەگەڵ جنابی سید مظهر كاتبی شێخ كە ژن برای سید موحەممەدی مدرس بو، لەگەڵ قەرەباڵغێكی زۆرا رۆیشتین بۆ دوروه تا ئەوان ماڵی سید محمد بگوێزنەوە بۆ بیارە، مینش لەوێ دابنیشم، بەو رێگەی هەورامانا زۆر بە سەیران و صەفا و خۆشی ڕامان بوارد، بەلاٚم كە گەیشتینە دورووه حاڵیمان بو، بەگزادەی (ڕەزاد) لە بیستنی نقلی سید محمد زۆر عاجز و ملول و پەرێشانن، قەراریان دابو منعی ئەم نقله بكەن، چونكە لەو رۆژا بۆ گەلێ اموراتی حكومەتی هاتوچۆی شاری سنه بە شێوەی واجب (ل/104)[1] پێویستیان بە سید محمد هەبو، كە لە وەزعەكە حاڵی بوین سەیید مظهرنامەیێكی نوسی بۆ خزمەتی شێخ بۆ بیارە، داوای ئەوەی كردبو لەشێخ كە دەستور العمل مان بۆ بنوسێتەوە ئێمە چی بكەین، لەپاش چەند رۆژێ نامەی شێخ هات، لە نامەكەدا ئەمری فەرموو بو بەمن كە بگەڕێمەوە بۆ بیارە..[2].. پاش گەیشتنی ئەم نامە من لە دورووه دەرچوم هاتمەوه بۆ بیارە، پاش زیارەتی شێخ مانوحەسانەوەم شێخ بانگی كردم، مامۆستا مەلا بهاءالدینیش لە خزمەتیا بو فەرموی ئەتوانی لە بیارەدا دانیشی تدریس بكەی؟! ئیشارەی كرد بەوە ئایا ئەتوانم بەرامبەر مخالفه بەربەرەكی معارضین خۆم بگرم، منیش عەرزم كرد ئەگەر مەقسەدتان تەوانای تدریس بێ ئەوەندە بتوانم كۆشش ئەكەم، ئەگەر مەبەس مخالفاتی خەڵك بێ (وعلى الله فلیتوكل المؤمنون) ئەكەم بەسەرمەشقی خۆم. شێخ فەرمووی: مبارەكە، تۆ لەم تاریخەوە مدرسی بیارەی، جا فەرموی: ئەی بۆ معیشەت هۆی گوزەرانت چی ئەڵێیت؟! عەرزم كرد لەم بابەتەوە هیچ ناڵێم شێخ خۆی وەكیل بێ هەر نەوعە معیشەتێ ببێ من ئەساچێنم. بەم قسانە تعیینم تەواو بو، بەلاٚم شێخ فەرمووی[3] ئەم دوو سێ رۆژی كۆتایی مانگە بڕوا جا لە غرەی محرمی 1347ك–1928ز پیاو ئەنێرم بەشوێنی خانوەكەتا لە نەرگسەجاڕەوە نقلی بكەن بۆ بیارە.

واقعا لە ئەوەڵی محرمی ئەم تاریخەوە شێخ ناردی ماڵەكەیان گوێزامەوە بۆ بیارە، لەڕێوە كە هاتین لە ماڵی (سەربورج) خانوی شێخ صاحب و شێخ سیف الدین كوڕانی مرحوم شێخ نجم الدین دامەزراین والحمدلله. (ل/106)

پاش ئەوە ماڵەكەم گوێزراوە بۆ بیارە، دامەزرام، ئەم هەواڵە بلاٚوە بو بە وولاٚتا، جا لە هەمو لایێكەوە طلبه رویان كردە بیارە بۆ خوێندن بە ماوەیێكی كەم بێجگە لەو چەند طلبەی خۆمە كە لە نەرگسەجاڕەوە هاتن بۆ بیارە، قەرەباڵغێكی زۆر لە

[1] ل/105، نامەیەكی مەلا صالحی كۆزەپانكییە، بۆ مامۆستای مدرس و لەكۆتاییەكەی نوسراوه (مخلصكم الطالح الكۆزەپانكی صالح –المدرس بأربیل).

[2] نامەكە لە ل/106 دا چەسپ كراوه.

[3] لێرەدا پەڕاندێك لە دەستنوسەكەدا دەبینم كە بەم شێوە نوسراوه (بەلاٚم شێخ ئەم دو ێ رۆژی ئاخری مانگە بڕوا...) بەپێویستم زانی ووشەی (فەرموی) بۆ زیاد بكەم.

طلبه له مدرسەدا حاضربوون.

## هۆکاری ڕەغبەتی فەقێیان لە بیارە

هۆکاری ڕەغبەتی تەڵەبە بۆ بیارە چەن شتێ بوو:

یەکەم: بیارە شوێنێکی مقدس و پیرۆز بو خەڵك بە ئومێدی بەرەکەت بەختیاری رویان ئەکردە ئەو شوێنە بەتایبەتی کە محاسنی شریفەی حضرەت ﷺ چەند تالا لە موی ڕیشی مبارەکی پێغەمبەرﷺ لەبیارەدا حاضر بون.

دوەم/ شێخی بیارە بە پەیڕەوی ئەسلافی خۆی زۆر ڕەغبەتی لە خزمەتکردنی تەلەبەدا هەبو، بەچاوی حورمەت تماشای ئەکردن.

سێهەم/ لە لطفي خواوە شۆرەتی کۆشش وسعی من لەگەڵ تەلەبەدا بە وولاتەکەدا بلاوبوبوەوە، بەراووردیان کرد کە فەقێ لەلای من زۆر استفادە ئەکا.

چوارەم/ تەلەبەکان غالبا مسنوبی شێخی بیارە بون، زۆر تالبی ئەوە بون کە لە نزیکی شێخدا دانیشن، چاویان لە شێخەوە بێ.

پێنجەم/ شوێنی بیارە زۆر شوێنێکی خۆش و ئاودار و باغ دارە، بەتایبەتی بۆ هاوین و بەهار، چەن مانگێ لە پایز وەکو بەهەشتی سەر عەرز وەهایە.

شەشەم/ لەبەر ئەوە کە هەموو ئەسبابی گوزەرانی فەقێکان تەنیا لە ماڵی شێخەوە بو، ئازادبون لە حەول دان بۆ گوزەران ژیانی خۆیان.

حەوتەم/ بیارە بە نسبەتی باقی شوێنەکانی کوردستانەوە زۆر شوێنێکی ئیجتماعی بو، هەمیشە گەلێ لە علماو ادبا و متصوفین پیاوی مشرەب بەرزی تیابو.

جا معلومە شوێنی وەها هەمیشە خەڵك تالبی ئەبێ.

سەرەڕای ئەمانە هەمو لە ئەوەڵەوە شێخ اعلانی ئەوەی کرد هەتا مجال بێ لە خانەقا و مدرسەدا بسورت (لاردّ) تلبە قبوڵ ئەکا.

بەم هۆیانەوە بیارە وەها پڕبو لە تەڵەبە کە لە پاش مغرب بەسەربانی خانەقا و حەوش و دەوروبەری خانەقادا تەلەبە بە عادەتی کوردستان دەستیان بە دەورکردنەوە ئەکرد، ئەوبەرو ئەم بەری بیارە کە دوو کێوە دەنگی ئەدایەوە، بەڕاستی بە دامەزراندنی مدرسە لەسەر ئەم شێوە و شەکلە، بیارە خانقای بیارە سەر لەنوێ تازە بوەوە، نمونەیێکی جەمال و شێوە جوانەکەی زەمانی حضرەتی ضیاء الدین حضرەتی نجم الدین وجودی مبارەکی مەلای بیارەو مستعدەکانی نیشان ئەدا.

وە پاش دامەزرانم لەلایەن هەموو دۆست و برادەرێکەوە نامەی مبارەکبایم بۆ هات، بەڕاستی بۆ وجود و شخصیەتی منیش دنیایەکی نوێ و ئافاقێکی تازە کرایەوە، نیشاطی زیاد لە نیشاطی پێشوم بۆ پەیدا بو ولله الحمد على ذلك. (ل/107)

وە پاش دامەزرانم لەسەر یاسای خۆم کە هەموو هەواڵێکی خۆمم ئەنوسی بۆ خزمەتی شێخ عمر اعلى الله مقامە، نامەیێکم بۆ نوسی باسی ئەمری شێخ، تعیینی خۆم لە بیارە نوسی بۆی، ئەویش گەلێ مسرور و دڵشاد بوبو. ئەم نامەیەی خوارەوەی بۆ نوسیبوم[1]:

بەنوسینی ئوستادم بۆ ئەم نامەیەو گەیشتنی بەدەستم زۆر شاد بوم، بەلام بەیاسای وەضعی ئینسان کە شەرم ئەکا لە شوێنی پیاوی گەورە، زۆر لەدڵما ئەم گرێ بو، کە نەبادا معنویاً مرحوم مەلای بیارە بەم دانیشتنی منە متأثر بێ. قضاءاً

[1] نامەکەی شێخ عمر ابن القرداغی لە ل/108 دا هەیە و مێژوی 27/محرم/ 1347ك لێدراوە.

شەویٚ لەو بەینا لەخەوا ڕۆیشتمە دیواخانێکی زۆر بەحورمەت و جوان، کە تەماشام کرد ذاتێکی جوانی مێزەرەسەوز لە ژوری دیوەخانەکەدا دانیشتوە، لەوکاتا دوو فەقێی طالش هاتبون بۆ لام، مەلا اسد الله و مەلا عارف ئەوانیش لەگەڵما بون، ئەو ذاتە کە پرسی لە فەقێ طاڵشی یەکان ئەم مەلایە کێیە؟ ئەوانیش عەرزیان کرد: ئەمە ناوی مەلا عبدالکریم–ە، لەم بەینا شێخی بیارە کردویە بە مدرسی بیارە، کە ئەوان ئەم قسەیان عەرز کرد، ذاتی فەرموی: ئەی مبارەك بێ، مبارەك بێ، ڕۆڵە تا ئێستە نۆبەی ئێمەبو، جا نۆبەی تۆیە، هەستا لە دیوەخانەکە تەشریفی بردە دەرەوە.

کە لەم خەوە خەبەرم بوەوە، کەوتە دڵمەوە ئەو زاتە مرحوم مەولانا عبدالقادری بیارە بوەو ئەویش لە هاتنەکەی من مەسرورە... الحمدلله پاش ئەم خەوە ئەو مەراقەم نەما، بەڵکو قەرارم دا هەتا تاڵبێ زیاتر بێ دەرسێ زیاتر بێ، ئەوان احسانیان زۆرتر ئەبێ کەوابێ مسرور ئەبن. (ل/108).

پاش چەند رۆژێ لەبەر نزیك بونەوە لە خانەقا و مدرسە ماڵمان لەسەر بورج گوێزایەوە بۆ ئەوبەری خانقا، لە نەقسی خانوی شێخ دا هۆدەییێکیان پێدابن، تیایا دانیشتین، بەسەرگەرمی مەشغوڵی تدریس بوم، دو فەقێی طالشیش وارد بون، مەلا اسدالله مەلا عارف، بەڕاستی دوو ئینسانی خاوەن استعداد و قابلیەت بون، دەستیان کرد بە مختصری مطول بەم وەضعە ڕامان بوارد تا چوار مانگ یانی کەوتینە مانگی جمادی الاولی، لەم مانگا منداڵەکانمان وەضعی حملیان بو، کوڕێکمان بو، ناومان نا (اسعد)، لەم وەختا شێخ تەشریفی ڕۆیشت بۆ شاوەیس و باوەیس بۆ سەر مەرەزە و وارداتی خانەقا.

لە ئەثەری ئەم وەضعی حملە عائلەکەم بەنەخۆشینەوە مایەوە، لە ئەوەڵی مانگی جمادی الثانیة وەفاتی کرد.

بەم کارەساتە دەرگای گەلێ مەینەت لەسەرم کرایەوە، لەلاییێکەوە من غەریب و بێکەس بوم، لەلایەکەوە (فاتح) تازە لەشیر بڕابوەوە، پێویستی بە خزمەت بو، مهم تر لەوە ئەم کوڕەیش کە تازە لەدایك بوە کەس نییە شیری پێبدا، بەهەرحاڵ دایەنم بۆ أسعد پەیداکرد، کاغذیشم نوسی بۆ ماڵی خەزورم کە خەسوم بێت بۆ بیارە، پاش دە پازدە ڕۆژێ خەسوم.. ژنی مەلا عبدالله کە ژنێکی زۆر صاڵحە و عاقڵە بو هات بۆ بیارە، تۆزێ باری دڵم سوك بو، لەم لایشەوە بەهۆی تعزیەنامەی شێخ مامۆستا شێخ عمرەوە کە صورەتیان ثبت کراوە[1] بەهۆی بعضیٚ برادەر و (ل/109) دۆستەوە، کە هاوغەم و هاوبیرم بون دڵم تۆزێ مەینەتی لەسەر هەڵگیرا، ڕوم کردەوە حاڵی طبیعی خۆم.

پاش چەند ڕۆژێ خەسوم.. فاتحی لەگەڵ خۆیا برد بۆ ولاّتی خۆیان، أسعد مان لەلای دایەنی (خورشیدە)ناو کە لەدێی (بنجۆی درە) دائەنیشت دامەزران، بەس خۆم مامەوە.. پاش ئەم وەضعە لەبەر بێعائیلەیی دڵم پەرێشان بوو، دەکەوتمە تەلاش بۆ ئەوە ژن بێنم، عائلەکەم خوشکێکی بو (جمیلە) ناو کچی مەلا عبدالله، کە قورئانی خوێندبو، مناسبی حاڵ بو بۆ منداڵەکانم، لەسەر قەراری داواکردنی ئەم ژنە لە ئاخری پاییزا سەفەرێکم کرد بۆ (باوەجانی) بۆ ماڵی مەلا عبدالله. کە قسەکەم دەربڕی هەمو لاییێکیان قەبوڵیان کرد، رەغبەتیان بو لە ئیشەکەدا لەبەر خاتری منداڵەکان، بەڵام کوڕێکی مەلا عبدالله بو ناوی فتاح بو، ئەم کوڕە مەیلی نەبو عوزری ئەمەبو کە بیارە دورە لەوان، سیروان لەبەینایە، ئەیووت: وەکو چۆن ئەو خوشکەم مرد ئێمە فریای نەکەوتین، ئەمیش وای بەسەر دێت (ل/110).

پایزی ساڵی 1347ك–1928ز زۆر پەرێشان حاڵ بوم بە نەوعێ وەها کە مامۆستای گەورەم مامۆستا شێخ عمر نامەی تعزیەنامەی بۆ نوسیم، مەجالی دڵم ئەوەندە تەنگ بو، لەبیرم چووە تا جوابی نامەکەی بۆ بنوسم، تا تماشام کرد نامەیێکی دوهەمی هات بۆم..[2] داوای بەیانی حاڵ و وەضعی لێ کردبوم بۆی بنوسم، منیش بە مەعذەرەتەوە جوابی نامەکەم بۆ نوسییەوە، بەیانی ئەحواڵی خۆمم بۆ کرد، داوای دوعای خێرم لێ کرد، بەڵکو خوا لە لطفی خۆی فەرەج شادیێك بخاتە

---

[1] نامەکان لە ل/109 و 110 ثبت کراون.

[2] ئەم نامە لە ل/111 دا هاوپێچ کراوە.

دڵم، جا ئەم نامەیە هات بۆم[1]، الحمدالله پاش ئەمە حاڵم روی کردە باشی، لەگەڵ تەلەبەکان مشغوڵ ئەبوم، ئەو زستانە ڕابورد.

لە بەهارا بە ارشادی فقێ محمدی قەڵ بەزەیی کە دۆستی خۆم مریدی شێخی بیارە بو، ڕۆیشتین بۆ (کانی کەوە) لەشارەزور، خوازبێنی ئامینەی کچی شێخ عەلی خەڵکی شیوی قازیم لە شێخ محمدی برای کرد، إجابەیان کرد گەڕاینەوە بۆ بیارە تا لە هاوینی ساڵی 1348ك. دا گوێزامەوە بۆ بیارە، پاش ئەوە دایەنەکەی أسعدی کوڕیشم هێنایە لای خۆمان، بەم وەضعە زۆر دڵم مرتاح بو، شێخ علی خەزورم کوڕی شێخ قادری کوڕی شێخ قادری کوڕی شێخ عثمان ی کوڕی شێخ عبداللطیف ی گەورەی کوڕی شێخ معروفی دەرقوڵەیە، شێخ احمدی باپیرەی مەلاییکی گەورە، خلیفەی شێخ بهاء الدین بوە، دایکی ئامینەی عائلەم (رضیة) ناو کچی شێخ عبدالرحمانی شیوی قازی بوە، ئامینە خاڵۆزای مامۆسا شێخ عمر بو، مامۆسا شێخ عمر پورزای ئامینە بو، چونکی خاتون خدیجە دایکی مامۆسا شێخ عمر خوشکی شێخ علی باوکی ئامینە بو، ئەم خزمایەتیە مناسبەیێکی (ل/111)[2] زیادەی پەیداکرد لە بەینی من و مامۆسا شێخ عمرا، طبعاً ئەویش بەم خزمایەتیە مەسرور بو، چونکی یەکێ لە ئەولادە حەسەبیەکانی علاقەی مصاهرەی لەگەڵا پەیداکرد.

## دوو بەسەرهاتی خۆش

(من جملە) پاش دامەزرانی شێخ بابا رسول لە عەبابەیلێ و لەپاش دامەزرانی من لە بیارە دا لە ساڵی 1347ك–1928م، ئەم ذاتە لەگەڵ کۆمەڵی مەلاکانا هاتن بۆ بیارە، کاتێ ئێمە خەبەرمان زانی ڕۆیشتین بە ئیستقبالیانەوە لەنزیکی دەرگای (نانەواخانە) بەیەك گەیشتین، لەپێش ئەوا کە بە یەك بگەین شێخ بابا رسول هەردو دەستی بڵاوکردەوە تا گەیشت بە من، دەستی کردە ملم، فەرموی: مەلا کریم! لەگەڵ ئەوا ئەم مەقامە زۆر بەلای ئێمەوە بە حورمەتە، زیارەتی لەسەر ئێمە وەکو واجب وایە، من ئەم سەفەرە هەر بۆ لای تۆ مبارەك بادی تۆ کردوە، گەلێ قسەی پیاوانەی وای کرد لەگەڵ منا، چەن ڕۆژ لە بیارە مانەوە جا ڕۆیشتنەوە، ڕۆژ بەڕۆژ وەضعی اجتماعی علمای هەڵەبجە چاتر ئەبو، محبت لەناوا زۆرتر ئەبو.

لە بەهاری ئاخری ساڵی 1347ك–1928م مامۆسای گەورەم لەسەر وەعدەی خۆی کە بڕیاری سەفەری بیارەی دابو، لەگەڵ کۆمەڵا لە علمای محترمین دا، وەکو شێخ بابا علی مدرس لە مزگەوتی خۆیانا شێخ عبدالکریمی احمد بڕندە، مەلا عزیزی پریس، شێخ رسولی تەکیەیی مدرس لە مزگەوتی جامعەی هەڵەبجە، شێخ بابارسول مدرسی عەبابەیلێ، مەلا عبدالله مدرس و امامی دەرەشیش، حاجی مەلا عمری عمر گونبەدی، مەلا قادری ڕەش، کە ئەم دو کەسە هەردویان مەلا بون، یەکەم لە مزگەوتی خۆیانا لە کەرکوك، دوهەم لە دەوری کۆیە، بۆ خوێندنی ریاضیات هاتبون بۆ سلێمانی بۆ خزمەتی مامۆستا شێخ عمر، لەگەڵ چەند کەسێ لە مناسبینی ئەم ذاتانە، وەکو کۆمەڵەی ئەستێرەی (کۆ) کە لە بەرەبەیانێکی صافا طلوع بکەن، وەها تەشریفیان لە أفقی بیارەوە دەرکەوتن، ئێمەش هەمو لایێ مەلا و تەلەبەو پیاومناسبانی خانەقای بیارە ڕۆیشتین بە استقبالیانەوە بەشادی واردی خانقا بون (ل/113).

ئەم سەفەرە گەلێ سەفەرێکی خاوەن صەفا بو، دەمێ زەمان بۆ کۆمەڵێکی وەها لە عالمە گەورە بەرزەکان بەو ذەوقو شەوق و شادیەوە لە بیارەدا گردنەبوبونەوە، نسبەت بە من بەتایبەتی زۆر بەسود بو لەلاییێکەوە زیارەتی مامۆستام، بەخزمەت گەیشتنی ئەم ذاتە گەورانە گەلێ ڕوناکی خستە دڵمەوە لەلایەکی ترەوە بۆ من بەهۆی حورمەت و کەرامەت دەرچو.

مامۆستا شێخ عمر لەناو قەرەباڵغیەکی گەورە فەرموی: مەلا کریم هەرچەن زیارەتی بیارە زۆر مەقسەدی ئەهلی عیلمە،

---

[1] ئەم نامە لە ل 112 دایە.

[2] نامەیەکی شێخ عمری تیا ثبت کراوە.

بەڵام من بەشی زۆری ئەم سەفەرەم لەبەر خاطری چاوپێكەوتنی تۆبو.

وە لەكاتێكا بە خزمەتی گەیشتین، مامۆستا شێخ عمر گەڵێ لە خزمەتی شێخ دا تقدیری منی كرد، لە جملە فەرمودەكانی یەكێ ئەمە بو فەرموی: یاشێخ پێویستە زۆر یارمەتی مەلا كریم بكەی بۆ ئەوە لە تدریسا موفق بێت، عیلمی زیاد بكا، ئەم ذاتە لەمن مەلاتر ئەبێ یانی ئەگەر شێخ لطف بفەرموێ لەگەڵیا، ئەوەی ئێمە زانیومانە لە خوێندنا وەری گرتوە، بەهۆی تدریسەوە ئەتوانێ زیادەشی بخاتە سەر، یەكێ لە یارمەتیەكانی ئەمەیە، كە بە ئارەزوی خۆی فەقێی مستعد ڕابگرێ، نەك هەر فەقێیێك بێت بەهۆی نسبەتی بە شێخەوە مجبور بكرێ لەسەر تدریسی، ولو كان ئەو فەقێ قابلیەتی خوێندنیشی نەبێ، ئەمە ئەبێ بەهۆی دواكەوتن لە تدریس و بڵاوكردنەوەی عیلمدا، گەڵێ قسەی جوانی تریشی فەرمو، لە واقعا شێخ مقابل بەم قسانە زۆر بە ئیقبالەوە جوابی دایەوە، فەرموی: مەلا كریم وەك ئەولادی خۆم وایە، لەگەڵێ جهەتەوە منظوری ئێمەیە، گەڵێ جار بە قصدی زیادی علم توجهم دەرحەقی بوە، ئومێدم وایە ان شاء الله گەڵێ تەرەقی بكا.

هەر لەم سەفەرا ڕۆژێ لە حوجرەی شەرقی خانەقاوە كە ئێستە نەماوە كراوە بە بازاڕ، هەمو مەلاكان لە خزمەتی مامۆستا شێخ عمرا دانیشتبون، مەلا عارفی بانەیی حاضر بو، ملا عباس كە ئێستە لە گەرمیانە ئەویش حاضر بو، باسی عیلم هاتە پێشەوە، مەلاعارف وتی: من میزانی هەمو شێوەو باقی مەلاكانی لیوای سلێمانی ئەزانم، نیسبەت بە هەریەكێ قسەیەكی كرد، لە ئاخرا لێیان پرسی ئەی مەلاكریم چۆنە؟ ئەویش وتی: بەخوا مەلاكریم ئەتوانێ شەرحی مواقف بە فەقێی ئەم زەمانە بڵێت، قسەكەی هەرچەن لە سیاقی تعریف بو، بەڵام ذو الجهتین بو، ئەوەشی ئەگەیاند كە بۆ فەقێی ضعیف ئەتوانێ تدریسی كتێبی وا بكات.

لەسەر ئەم قسانە مەلا عزیزی پریس فەرموی هەڵسن بڕۆین بۆ حوجرەی مدرەسە، لەویا بە تحفەوە كتێبە گرانەكان ئەم مەبەستە دەربخەین كێ مەلای چاكە، فعلاً بۆ خۆشی هاتن بۆ مدرسە، مەلا عارف تحفەی هێنا شوێنێكی لەمن پرسیەوە، شوێنێ لە مەلا عزیز لە قاموس دا شوێنێكی لە مەلا عباس پرسیەوە، مامۆساكانیش هەمو دانیشتون، بەڕاستی ڕۆژێكی سەیر و خاوەن صەفا و رابواردنی علمی بو، تا دەورەی حەفتەیێ ئەم كۆمەڵە لە بیارە مانەوە (ل/114) پاش ئەوە تەشریفیان ڕۆیشتەوە بۆ هەڵەبجە، لەپاش یەك دوو ڕۆژ لە هەڵەبجە بڵاوەیان لێكرد، هەر یەكێ ڕۆیشتەوە بۆ شوێنی خۆی، بەڵام ئەو تأثیرە ئەم سەفەرە كردی لەناحیەی ئێمەدا لەبیرمان ناچێتەوە.. (ل/116)[1].

## وەضعی خۆم[2]

لەساڵی 1347 ك –1928ز كاتێ كە لە خانوەكانی شێخ صاحب گوێزامانەوە بۆ هۆدەیێ لە خانوی شێخ لەوبەری خانەقاوە نزیكی دو مانگ لەو هۆدەدا ماینەوە، جا شێخ ئەمری كرد لە ڕیزی ماڵی خۆیا چەند هۆدە خانویان كردەوە، دو هۆدەیان بۆ من، دو هۆدەیان بۆ سید نظام الدین كە خزمەتی شێخی دەكرد، دایكی فاتح لەم خانوە تازەدا وەفاتی كرد، پاش وەفاتی ئەو پایز و زستان و بەهاری اخری ساڵی چل و حەوت من خۆم لە مدرسەدا ئەنوستم، ئەو خانوەم بەجێ هێشت بو، لەبەهاری ئاخری 1347ك كە ئامینەی كچی (شێخ علی)م هێنا سێ مانگ لەو خانوانا ماینەوە، پاش ئەوە گوێزامانەوە بۆ بەری خانقا، لە هۆدەیەكی نزیكی حوجرەی شێخ كە وەختی خۆی هۆدەی حضرەتی ضیاءالدین بوبو، شێخی بیارە لەپاش هاتنەوەی بۆ بیارە بە پارە كڕی بوی لەشێخ زین الدین، باقی ئەولادەكانی مرحوم شێخ نجم الدین دامەزراین... (ل/117)[3].

---

[1] لێرەدا مامۆستای مدرس باس لە گوێزانەوەی ئامینەی دوەم خێزانی بۆ بیارە و وەفاتی خێزانی شێخ عمر (حەلاوەخان) و مەشغەڵەتی مدرس لە خانقای بیارە و نەچون بۆ پرسەی دەكات ل116–117.

[2] ئەمە سەرباسی مامۆستای مودەرریسە ل/117.

[3] لە ل/ 118 و 119 دو نامەی شێخی علائەدینە.

تاریخ گەیشتە 1348ك–1929ز جا لە فصلی پایزا وورده وورده دەستم كرد بە نوسینی رسالەی عزیزە لە علمی منطقدا، ئەم رسالەمە بۆ ئەوە تالیف كرد كە مەلا عزیزی بانەیی كە ئێستە بەرحەیاتە[1]، ئیمامی دێی (قەلاّجیّ)یە لە دیوی هەورامان.. بیخوێنیّ، فعلاً ئەو و گەلێك لە طلبەكان نوسیانەوە، خۆندنیان.

هەروا بەدوای ئەما رسالەیێكی منظومەم لە علمی (تجوید)دا تألیف كرد، پاش ئەوە رسالەی (كشف الغامض من أحكام الحائض)م تألیف كرد، ئەم رسالەش زۆر بەسودە، لەناو مجموعەی فەتاوای علمای خۆمانا نوسیومەتەوە[2]... ئەم پایزو زستان و بەهاری 1348ك گەلیٚ موفق بووم، گەلیٚ طلبەی باش طالبی خوێندن لە بیارەدا گردبونەوە. مەلا أسد الله ی طالش، مەلا عارف ی طالش، مەلا محمد زاهدی رباطی، غەیری ئەمانەیش لە بیارەدا ئەیان خوێند، نشاطی تحصیلی علم زۆر بو...

لەمانگی شەعبانی 1348ك–1930ز شێخی بیارە بە خەیاڵی سەفەری بەغدا رۆیشت بۆ ئەوبەری سیروان بۆ دێی (گومە)، گەلیٚ مریدو منسوبی لەخزمەتا بو، ئەمری فەرمو كە جەنابی شێخ عبدالكریم مدرسی احمد برندەیش لەگەڵیابیٚ، فعلاً شێخ عبدالكریم رێكەوت، ڕۆیشت بۆ خزمەتی، لەو میانەدا منیش لەگەڵ مامۆستا مەلا بهاء الدینا مامەوە لە بیارەدا بۆ ئەوە كە ئەو مەشغولی أموراتی خانقا بیٚ، منیش مشغوڵی تدریس ئیدارەی قوتابییەكان بم، كاتیٚ شێخ ڕێكەوت ئەمری فەرموو بەمن كە هەر مەصرەفیٚ بۆ عائلەی پێویست بیٚ بە إشرافی من بیٚ، بەبیٚ إطلاعی من هیچ نەكریٚ، ئەم ئیشە تا ئەندازەییٚ لەسەر شانم گران بو:

یەكەم: لەبەر ئەوە بۆم نەدەكرا باش إشراف بكەم بەسەریا.

دووەم: ئەبو بەهۆی ئازاری دڵی عائلەو متعلقاتی شێخ لە من.

وە پاش ماوەییٚ بە واسطەی سید مظهری كاتبەوە نامەیێكم نوسی داوای ئیذنم كرد برۆم بۆ گومە، بەڵكو خۆم لەم زەحمەتە دەربكەم لە عهدەی ئەو ئیشە دەرچم، ئەگەر إمكان ببیٚ بڕۆم بۆ ماڵی خەزورم چاوم بە فاتح بكەویٚ، بەڕاستی خەیاڵی مارەكردنی ژن خوشكەكەیشم لەدلا مابو، بەلاّم شێخ بەم نامەیە[3] مەنعی ڕۆیشتنی كردم، بە خطی خۆیشی لە حاشیەی نامەكەدا نوسیبوی، ئەگەر بە قصدی ئەو ئیشەیش كەوا لە دڵتا بێت.پێویستە دڵت لەو خەیاڵە وەرگێڕی، ئیتر بەناچار لەبیارە دەرنەچوم.(ل/121)[4].

سەفەرەكەی شێخ درێژەی كێشا تاكەوتە ساڵی 1349ك–1930ز ئەوجا گەڕایەوە...لەم ساڵی 1349ك. من زۆر موفق بوم، وەرسالەی(ورقات)لە منطقا، و(مقالات) لەباسی مقولاتی عەشەرە وەبەعضی أموری حكمەت لە اعتباریات وەأموری عامە، وەرسالەی (وجیهە)لە علمی منطق دابەتایبەتی لەباسی (موجهات)داتالیفم كردن، وەگەلیٚ لە طلبە كان نوسیانەوە وەخوێندیان.

بەڕاستی ئەم ساڵەلە هەموو جیهەتێكەوە بەخۆشی لەسەرمان ڕابورا ولله الحمد.(ل/127)[5].

لە ساڵی 1348و1349ك، نفوذی پەهلەوی لەسنوری ئێمەدا هێزی گرتبو، لەو میانەدا ڕۆژیٚ سلطانیٚ هات بۆ بیارە ولە خزمەتی شێخ دا دانیشت، گەلیٚ باسی احترامی ئال و بەیت و مذهە بی هەوا خوا هانی ئەوانی كرد، بەلاّم زۆر مبالغەی تیادا كرد بەنەوعیٚ گەیشتە ئەو پایەوتی:هەركەس لەژێر ادارەی ئیمامەت و خەلافەتی ئەوانا نەبیٚ (أموراتی دینی تەواو

---

[1] مەبەست پیٚ ساڵی شەستەكانی كاتی نوسینی ئەم كتێبە.

[2] مەبەست پیٚ (جواهر الفتاوی)یە كە مدرس زۆرێك لە فەتوای زانایانی كوردی تێدا زیندوو كردوەتەوەو لە فەوتان قوتاری كردون.

[3] ئەم نامە لە ل/121 دایە.

[4] ل/122–127 باسی درێژی سەفەرەكەی شێخی علائەدین دەكا و شەش نامە كە لەو ماوەدا لەنێوانیانا گوزەریوە باس دەكا و وێنەی نامەكانیشی تێدایە.

[5] لێرە بەدواوە باسی وەفاتی شێخ جمیل برای شێخی بیارە دەكات و كورتەژیانێكی باس دەكا و چەند نامەیەكی ابن القرداغی داناوە تا ل/131.

نابێ ) (ل/131)[1].

لەویا شێخ لەبەر رعایەتی ئەوە كەخاوەن ماڵ بو، وەكابرایش میوان بو جوابی نەدایەوە، بەڵام من خۆم پێنەگیرا، وتم: ئاغە! مادام ئەم فەرمایشتە ڕاستە كەهەر كەس لە ئیدارەی ئەوانا نەبێ اموراتی دینی تەواو نابێ، ئەهلی تشیع بۆچی لە غەیری زەمانی ئیستیلای صفویەكانا لەم وڵاتە تا ئێستە جاریٚ نەبو كە یەكێ لە سادات بكەن بە امام و گەورەی خۆتان، بۆچی ئیطاعە ی غەیری ئەوان ئەكەن؟!

كابرا لەجوابا قسەی بۆ نەماوە، ئەوەندەی ووت: ئێمەش لەم بابەتەوە مقصرین.(ل/132)

## سەفەرێك بۆ باوەجانی [2]

هەر لەساڵی 1349ك–1930ز سەفەرێكم كرد بۆ (باوەجانی) بۆ ماڵی مەلا عەبدوڵڵای خەزورم بۆ چاوپێكەوتنی فاتح، وەلەم ساڵا (أسعد)ی كوڕیشم برد بۆ ئەوێ، وەلەلای دایە گەورەیابەجێم هێشت تالە عمری چوار ساڵیدا لەلای ئەوان وەفاتی كرد، وەلە قبرستانی شێخ شملی لە قەراخی ئەم بەری ئاوی بوارەوە دەفن كراوە.

لەم سەفەرا لەماڵی أمیر أسعدا تصادفی (سلطان حیدرخان)م كرد، كەفەرمانداری ئەو منطقە بو وەگەڵێ مناظرە ی مذهەبی لەگەڵ كردم.

لە ئەوەڵەوە بەڕستی من نەم وێرا بەسەربەستی قسەی لەگەڵا بكەم، تائەو بەهەموو صەراحەتێ مەیدانی مرخص كرد، جاپێم ووت: مادام وایە قسەت لەگەڵا ئەكەم: طبعاً تۆ باوەرت بەقورئان هەیە ؟ وتی: بەڵێ، وتم كەوابێ، من استدلال بە حدیث ناكەم، چونكی ممكنە تۆ بڵێیت ئەم حدیثە موضوعە، وەتۆیش استدلال بە حدیث مەكە، چونكی ممكنە من لە صحەت اسنادەكەیا قسەم ببێ، بەس دەلیلی هەردو– لامان باقورئان بێ، یا دەلیلی عقڵی.

وتی:باشە!

وتم:خودا لەقورئانا بە صورەتی عام تعریفی ئوممەتی پێغەمبەر ﷺ ئەكا بەئایەتی (كنتم خیر أمة أخرجت للناس)[3] مخاطبی دەرەجە ئەوەل ئەصحابەكانی بون.

وەبەصورەتی خاص بە ئەصحابەوە ئەفەرموێت، (والذین معە أشداء على الكفار رحماء بینهم...)[4] تا أخری ئایەتەكە.

هەروا لە شأنی ئەصحابی حدیبیە دا ئەفەرموێت (لقد رضی الله عن المؤمنین الذین یبایعونك تحت الشجرة، فعلم مافی قلوبهم، فأنزل علیهم السكینة وأثابهم فتحاً قریباً)[5].

وە لە شأنی سابقین لە مهاجرین و أنصارا ئەفەرموێت: (والسابقون الأولون من المهاجرین والأنصار والذین اتبعوهم بإحسان، رضي الله عنهم ورضوا عنه)[6].

كەوابێ چۆن موسڵمان ئەتوانێ لەگەڵ ئەم هەموو ثەنا و ستایشی عام و خاصە باوەڕ بكا بەوە ئەم جەماعەتە بەرامبەر بە وەصیەتی پێغەمبەر ﷺ ئیهمالیان كردوە، وەصیەتی ئەویان بەجێ نەهێناوە، یا ئەبێ كەلامی دەربارەی ئەوان ڕاست نەبێ –العیاذ بالله– ئەمە مەحاڵە، یا ئەبێ ئەمانە لەسەر دەستوری حەق معاملەیان كردبێ، بەیعەتیان بە حضرەتی ابوبكر موافقی حق بێ.

---

[1] مامۆستای مدرس لە ل/131 تەنها ئەوەندەی نوسیوە و تەواوی نەكردوە ئەوەی نێو كەوانەكە زیادكراوی ئامادەكارە، بە قەرینەی لەوەوپاش نوسیومە.

[2] ئەم سەرباسە هی ئامادەكارە.

[3] سورەتی آل عمران / 110.

[4] سورەتی الفتح /29.

[5] سورەتی الفتح / 18.

[6] سورەتی التوبە /100.

وە لەلایەنی (أمير المؤمنين)ەوە ملاحظە بكەین، ئەگەر خلافەتی ابوبكری بەحەق نەزانیایێ، چۆن جاریەی بنی حنیفەی لە ابوبكر قبوڵ ئەكرد، ئەگەر لە عمری كوڕی خەتتاب عاجز بوایە، بە غاصبی خلافەتی بزانیایێ چۆن كچی خۆی بۆ مارە ئەكرد.

وە ئەگەر لەو عصر و زەمانا خلافەتی بە حەقی محضی خۆی بزانیایێ، چۆن لەماوەی بیست و چوار ساڵا لە زەمانی سێ خەلیفەدا لە حەقی شەرعی خۆی چاوپۆشی ئەكرد، ئەمانە هەموو دەلیلن لەسەر ئەوە كە حضرەتی أمیر خلافەتی ئەو ذاتانەی بەحەق زانیوە، ئەگەر نا كەسێ أسد الله بێ ئەوەندە ساڵ لە حەقی خۆی لەبەر ترس، یا لەبەر مانعێكی احتمالی دەسبەردار نەدەبو، لە ئەنجاما كابرا قسەكانی قبوڵ كرد. (ل/135).

## نێوان من و قزڵجی لە بیارەدا [1]

لە ساڵی 1350ك–1931ز لەمەوسمی ئەوەڵی هاوینا لەمانگی صفرا، مەلا محمدی قزڵجی واردی بیارە بوو، مامۆستا شێخ عمر ئەم نامەیە بۆ من نوسیبو [2].. توصیەیشی كردبوم كە خزمەتی مەلا محمدی قزڵجی بكەم... [3].

ماوەی چوار مانگ لە بیارە مایەوە، لە حوجرەی مدرسەدا لە منزڵی منا دانیشت، بە هەموو نەوعێ شێخی بیارە حورمەتی ئەگرت من و طلبەكان دڵمان رعایت ئەكرد، بە یەكەوە ڕامان ئەبوارد، لە مانگی جمادى الثانيەدا لە بیارە دەرچو، ڕۆیشت لەدێ (سەراد) لەناحیەی پشدر بە موفقی بە صورەتی مەلایەتی دانیشت بە خەیاڵی ئەوە پایز كە شێخ ئەڕوا بۆ بغدا، لەگەڵ شێخدا بڕوا بۆ بغدا، شێخ سعی بكا بۆ دامەزرانی، واقعاً لە ئەنجاما فكرەكەی جێبەجێ بو، وەكو لەمەولا انشاء الله باسی ئەكەم. (ل/136)

لەم ماوەدا كە مەلا محمدی (تورجانی) حالاً (قزڵجی) اصلا لە بیارەدا بو، هەر لەحوجرەی مدرسە دابو غالباً لەو كاتانا من دەرسم بە فەقێكان ئەووت ئەو دائەنیشت یا ڕائەكشا، بەڵام ئەیوت بەمن پەكی دەرسەكان نەخەم، فعلاً منیش بەیاسای خۆم دەوامم ئەكرد.

بیستم ڕۆژێ شێخ پرسیاری كردبو فەرموبوی: مەلاكریم مەلاییێكی چۆنە؟ ئەویش بە حسنی ظنی خۆی لەوەڵاما فەرموبی: بەڕاستی جێگەی وەكو بیارە مەلاییێكی وەكو مەلا كریمی ئەوێ، گەلێ قسەی جوانی كردبو، جزاه الله بالخير.

لەپاشان نوێژی عصر ئەغڵەب لەگەڵیا ئەچوم بۆ باغاتی بیارە، یا بۆ چەمی (هانە گەرمڵە) یا بۆ چەمی بیارە، میوەی جوانم بۆ ئەهێنا ئەبوا ئەو میوەیە بەدەستی خۆی لەناو كانیە ساردەكانی چەمی بیارەدا بشۆریایەتەوە، ئەوسا میوەكەی ئەخوارد، یانی زۆر محافظە ی صحەتی خۆی ئەكرد.

لەساڵی 1350ك– 1931ز لەپاش طلوعی صوبح لەڕۆژی پێنج شەممە بیست و نۆهەمی مانگی ربيع الاول، لەوكاتا ئێمە لەو ماڵا بووین كە متصلە بە حوجرەی شێخەوە محمد لەدایك بو، لەوكاتا مەلا محمد لە بیارە بوو، منیش لەبەر ئەوە هێشتا لەدایك نەبوبو قەرارم دا گەر كوڕ بێ، ناوی (محمد) بێ، ئەم دو كەلمەمە نوسی بۆ شێخ[4] كە لەقەبێكی بۆ زیاد بكا، ئەویش لە حاشیەی نامەكە نوسی: هەر ناوی (محمد)[5] كافیە مایەی خێر و سعادەتە انشاءالله دوعای خێری بۆ كردبو.

شێخی بیارە زۆر محمدی خۆش ئەویست، گەلێ جار ئەی فەرمو ئەگەر مانع مەنعی نەكا، لە زەمانی یەكە إنسان ئەبێ،

---

[1] سەرباسی ئامادەكارە.

[2] لە ل/136 دا هاوپێچ كراوە.

[3] مامۆستای مدرس لێرەدا باسی سەفەرەكەی (قزڵجی بۆ (مصر) و (جامع الازهر) دەكا، لە گەڕانەوەیدا دوای ساڵێك لە شاری (كركوك) منع كراوە لە گەڕانەوە بۆ (مُكریان). ل/136.

[4] ئەم نامە لە ل/140 دایە.

[5] ووشەی (محمد) زیادكراوی ئامادەكراوەو لە دەقی نامەكەم وەرگرتوە بۆ زیاتر ڕونی ووتەكەی مامۆستای نامە.

زۆر ئەیلاوان.

وە دایکی حەمەیش زۆر خزمەتی پاکی حمەی ئەکرد، حەتا لەکاتی پاکیدا نەبێ شیری پێنەداوە، پاش تمیز خوێندنی تەواو کرد، شهادەی ریزی دوازدەی وەرگرت، بەڵام لەپاش ئەمانە گیرۆدەی گەلێ نالەباری بو، ئومێدم بە لوطفی خودا وایە ئەنجامی خێر بکا (وما ذلك على الله بعزيز، ربنا وتقبل الدعاء). (ل/140)[1].

## سەفەرێك بۆ بەغدا[2]

لەمانگی شەعبانی 1350ك دا مصادفی ئەوەڵی کانونی ثانی 1932ز، شێخی بیارە کەوتە ڕێگە بۆ شاری (بغدا)، گەلێ لە منسوبین شێخزادە من شێخ بابا رسولی عەبابەیلیێ لەخزمەتیا کەوتینە ڕێ بۆ ئەم سەفەرە، شەو لە هەڵەبجە دابوین لەماڵی شێخ عمرا، بۆ سبەینێ ڕۆیشتین بۆ شاری سلێمانی لە خانەقای حەزرەتی مەولانا خالیدا دابەزین، لە حوجرەکەی مامۆستا شێخ عمرا بوین بەمیوان، بەڵام حاجی عبدالله ی شاڵی و حاجی فقێ محمد نەیان هێشت کە مامۆستا شێخ عمر میوانداری (بکا)[3] ئەوان خۆیان لەبەر ئەوە کە لە قەدیمەوە مەنسوبی بیارە بون، ئەوان میوان داری یان کرد، مصرەفی شێخ واردینیان بەجێ هێنا..

ئێمە گەیشتینە خانەقای حەزرەتی مەولانا ئەوەندەی پێنەچو مەلا موحەممەدی قزڵجیش لەدێی سەراوۆ گەیشتبووە سلێمانی، لە عەینی ڕۆژا هاتە خانەقا بە عەزمی ئەوە لەگەڵ شێخ دا بێت بۆ بغدا، بەڵکو دامەزرێ، شێخ زۆر بە هاتنەکەی مسرور بو، هەموو لایێ پێمان خۆش بوو، بەخۆشی گرد بوینەوە.

بۆ سبەینێ پاش هەتاو کەوتن متصرفی سلێمانی ئەحمەد بەگی توفیق بەگ رحمهما الله، هات بۆ خانقا بۆ زیارەتی شێخ، قەدرێ لە خزمەتی شێخدا دانیشت، لەو ماوەدا فەرموی بە مامۆستا شێخ عمر یاشێخ وەکو ئەمری ڕەسمی پێتان ئەڵێم: لەمەولا ئەم ریاضە کۆنە تدریس مەکەن، وەلەسەر یاسای عیلمی تازە دەرسی ریاض بە فەقێ بڵێن، مامۆستا شێخ عمر دەنگی نەکرد، طبعاً پیاوێکی وەها گەورە لە مجلیسێکی وادا پێویستە قسەکەی وەربگیرێت، بەڵام من ئەوەندە هاتمە جواب عەرزم کرد، ئەگەر ئەمرەکە صرف بە ئارەزو بێت ئێمە ناچارین إطاعە بکەین، ئەگەر لەسەر ئەو ئەساسە بێ کە ریاضی کۆن هەڵەیە، ریاضی ئێستە ڕاستە ئەمە مُسلَّم نییە، دەمێ زەمانە لە عالەما علما لەباسی وەزعی عەرز و ئاسمان و ئەستێرە... قسە ئەکەن، گەلێ اکتشافات کراوە لەسەر ئەو اکتشافاتە ڕۆیشتوە، لەپاش ماوەیێ دەرکەوتوە ئەو اکتشافاتەیش تەواو نەبوە، بە نەوعێ تر گۆڕاوە، کەوابێ چاك وایە ئێمە بەتەواوی تەرکی ریاضە کۆنەکە نەکەین، بەڵکو لەگەڵ تدریسی ریاضی کۆنا کەمێ توجیهی طلبە بکەین بۆ ئەم اکتشافاتی تازەیە هەتا بەرچاویان ڕون بێت، لە مستقبلا بتوانن لەسەر روناکی علم بڕۆن بەڕێگەدا، وادەرکەوت متصرف قسەکەی منی بەلاوە باش بو، ئیتر معارضەی نەکردم.

هەر لە خانقادا بوین کۆمەڵی علماکان شێخ بابا علی مەلا حسێن، مەلا عزیزی مفتی هاتن بۆ زیارەتی شێخ، لە مجلسا بابەعلی فەرموی: یاشێخ! بۆچی ئێمەیش لەگەڵ خۆتانا نابەی بۆ بەغدا؟ (ل/152) شێخ لەبەر ئەوە لە قسەخۆشەکانی شێخ بابا علی شارەزابو، بۆ صوحبەت فەرموی: جا عەیبی چی یە! سەرو دوصەد ڕۆپیەیێ بۆ مصرف لەگەڵ خۆتانا بێنن تەشریف بێنن ئێمەش حەز ئەکەین بەیەکەوە ڕائەبوێرین.

باباعلی فەرموی: بەخوا یاشێخ ئەمە بەئێمە ناکرێت، بەس ئێمە (هو، هو)مان لەدەست دێت، یاشێخ ئەم (هو، هو)ە

---

[1] ل/141 نامەیەکی ابن القرەداغی یە، بەمێژووی 1350ك/ و ل/142 نامەیەکی شێخی علائەدینە، لە ل/143 باسی گۆڕانکاری لە خانەقاداو کردنەوەی ڕیزە دوکانێك لە بەردەمیدا، ل/144–151 باسی خانەقای بیارەیە و چەند نامەیەکی تێدایە و شیعرێکی جوانی نامی کە باسی هەورامان و بیارە و خانەقا و.. ئەو دیمەنە دڵرفێنانە دەکات و پێناسێکی زۆر ناسك و رێکی دەکات.

[2] سەرباسی ئامادەکارە.

[3] زیادکراوی ئامادەکارە.

مەبنیە لەسەر حكایت ئەو حكایەتەش ئەمەیە:

وەختی خۆی شێخێ لە گەرمیانەوە هاتووە بۆ ئەم ژورە، گەلێ دەروێشی لەگەلا بوە، بوە بە میوانی شێخێ لە ئەمثالی خۆی –كە ئەویش خاوەن دەروێش بوە–، شەوێ لەپاش نانخواردن دەروێشی شێخە میوانەكە حالێیان لێ هاتووە، ئاگریان خواردوە، ساجی گەرمی لستوەتەوە، گەلێ شتی وایان كردوە. شێخە خاوەن ماڵەكەیش ئەلا بە دەروێشەكانی خۆی، ئێوەش ذكر بكەن شتێ لە خارقە دەربخەن، خۆ ئێمە ئابڕومان چو، دەروێشی ئەم ذاتە ئەڵێن چی بكەین؟! ئەلا: ئاگر بخۆن. ئەڵێن ئەمەمان پێناكرێ.. ئەلا تیغ لەخۆتان بدەن. ئەڵێن پێمان ناكرێ. ئەویش ئەلا: ئەی چیتان پێ ئەكرێ؟! ئەڵێن ئەگەر ئەتەوێ (هو، هو)مان پێئەكرێ، ئەنا ئیتر هیچ. ئەویش ئەلا: (هو، هو)یش باشە –الحكم لله–.

ئەمما یاشێخ مەلای فەقیر غیری (هو، هو)، بەخوا نە لیرەی هەیە و نە ڕوپیە، نە نەختی تر، ئەبێ هەر بە (هو، هو) قەناعەت بكەی پێمان.

لەپاش دوو ڕۆژ لە سلێمانییەوە ڕێكەوتین بۆ كركوك، لە كەركووك بوین بەمیوانی خانقای سەیید ئەحمەدی خانەقا كە لە شێخانی سەرگەڵوە و لە نەتەوەی شێخ ئەحمەدی سەرداری خلیفەی حضرەتی مەولانا خالیدە–.. (ل/153).

ماوەی شەوو ڕۆژێ تقریباً لەخانقا ماینەوە، لەو ماوە كەما گەلێ شەهامەتو كەرامەتی سەیید ئەحمەدی بۆم دەركەوت، لەو ڕۆژا كە ڕێكەوتین بۆ بغدا، چوار پێنج شعرم نوسی لەسوپاسی وەزعی سید احمدا تقدیمم كرد، آخری شعرەكان لەسەر قافیەی (خانقا) بو شعری ئاخریا ئەمەبو:

یاربی پایەداری بكەی بەمایەی مەقامی عز

مـا دام ذو اللسـان بالإحسـان ناطـقا

فەرموی: بەخوا فلانی شعرەكاذت جوانن، بەلام ماوەی دوعایەكەت كورتە، لەبەر ئەوە لەم زەمانا ئەوانەی كە زمانیا ن بەچاكە بگەڕێ زۆر كەمن.

گەیشتینە بەغدا لە تەكیەی (خالدیە) لە محلەی (رأس القریە) لە قەراخی دجلەدا دابەزین لەبەر ئەوە ئەم تكیە بە تكیەی حضرەتی مەولانا ناوی دەركردبو، مرید و منسوبی بیارەش هەموو خالدی مەشرەبن بەتایبەتی شێخ عبدالحق حامدی نقشبندی كە خلیفەی شێخی بیارە بو، لەو تكیە دائەنیشت، تەكیەكە لەوكاتا بەردەوام خەتم و تهلیلەی تیا ئەكرا.

وە لەوكاتا حاجی رشید مدرسی تكیە بو، ئەویش انسانێكی عالم و سالم و عاقڵ و خۆش خوڵك و ڕەفتار بو، پاش واردبونی شێخ زانینی خەڵك بە هاتنی شێخ بۆ بغدا، لە هەمو صنفێ وزرا و أمرا و علما و مریدین و پیاوی مناسب ئەهاتن بۆ زیارەتی شێخ، بەهۆی ئەم زیاراتەوە لەگەڵ گەلێ پیاوی گەورەدا (ئاشنابوم)[1] وەكو حاجی نعمان أعظمی و شێخ ابراهیم ڕاوی، شێخ محسن الطائی و حاجی خلیل و شێخ قاسم القیسی و شێخ عبدالملك و شێخ عبدالقادر الخطیب بالإمام الإعظم و شێخ فؤاد الآلوسی و شێخ عبدالله الشیخلی...

لەو ماوەدا لە بغداد بوین، ڕۆژێ لەگەڵ مەلا محمدی قزڵجیدا ڕۆیشتین بۆ دائرەی ئەوقافی عامە، لەو ڕۆژا نوری القاضی مدیری ئەوقافی عام و منیر القاضي مدیری ادارەی ئەوقافی عام بو، زیارەتی منیر القاضیمان كرد، لەو دەما حاجی نجم الدین الواعظ حاضر بو.. (ل/154).

ڕۆژێ لەپێش مانگی ڕەمەزانا مەرحوم ملك فیصل شێخی دەعوەت كرد، كاتێ شێخ تشریفی برد، من و شێخ بابا رسول، مەلا موحەممەدی قزڵجی، بەعزێ لە منسوبین لە خزمەتیا ڕۆیشتین، لەكاتی زیارەتا شێخ معرفی مەلا موحەممەدی كرد، بەیانی ئەوەی كرد ئەم ذاتە لە بیت العلم ە، ساڵا لە مصرا رایبواردوە، بۆ زیادە معلومات لەویا ملك فیصل پرسیاری كرد لە مەلا محمد: یاشێخ! كیف وجدت مصر؟!

[1] ئاشنابوم، زیادكراوی ئامادەكارە.

عەرزی كرد: وجدتها مملكة راقية بالعلم، ومزدهرة بالثقافة، وأسأل الله أن يجعل العراق بحيث تحذو حذوها.

فقال الملك: إن مصر بالنسبة الى العراق عريقة بالمدنية، والعراق طفلة..

فقال القزلجي: ولذلك أرجو رقاها، فإن الطفلة إذا وقعت تحت تربية مُربّ محنك يسرع رقاها.

فأعجب الملك بجوابه ورحّب به كثيرا.

وە پاش ئەو ملاقاتە ایعازی كرد بۆ مدیری ئەوقافی عام لە اقرب وەختا تعینی بكا، واقعاً زۆری پێنەچو كە جەنابی مەلا محمد دامەزرا. هەرچەن لە ئەوەڵەوە وەضعی باش نەبو، بەڵام پاش ماوەیێ خۆی گرت وەضعی باش بو، بو بە خاوەن وەضائف: تدریس و امامەت و محاضرە لە كلیەی شریعەدا، القای نصایح بە كوردی لە دار الإذاعەدا، هەر وا بە حورمەت دەوامی كرد تا ساڵی 1959ز. وەفاتی كرد–رحمە الله وطاب ثراه–.

ڕۆژێ لە مانگی رمضانا لەگەڵ سید مظهر و حاجی شێخ حامد و میرزا ئەحمەدی ڕۆیشتین بۆ زیارەتی حضرەتی غەوث، لەو سەرەوە هاتینەوە لە كۆڵانێ نزیكی تكیەی خالدیەدا یەكێ هات بە پیرمانەوە، دەعوەتی كردین بۆ لای خۆی، تمەز مبشرێكی نصرانی بو، شێخ حامد وتی من ناییێم بەلامەوە ڕۆیشتن بۆ لای عەیبە!

من وتم: والله من ئەڕۆم، نەڕۆیشتن لەلام عەیبە. كاتێ دانیشتین بەخێراتنی كردین، پرسیاری كرد خەڵكی كوێن؟ وتم خەڵكی سلێمانی. وتی خوێندوتانە؟ وتم: بەڵێ. وتی: مەیل ئەكەن ئەم رسالە بخوێننەوە بزانن كە كتێبی اظهار الحق لە رَدّی ئێمەدا چەندی هەڵەیە. منیش وتم بدە كتێبەكە تماشای بكەم. كە تماشام كرد حاڵی بوم ئەو إعتراضاتە كە لە تفسیری إمام فخرالدین ی ڕازیا هەیە جوابیان ئەداتەوە لەم كتێبا نوسراوە، كراوە بە إشكال لەسەر ئێمە، بەبێ ئەوە باسی جەوابەكانی بكات.

منیش وتم: با جارێ لە پێشا من بزانم جنابت چیت! جا ئەوسا قسە ئەكەین لە محتوای ئەم رسالە.

وتی: من مبشرم بە دینی مسیح علیە السلام. وتم: مسیح كێیە؟!

وتی: تعجب ئەكەم تۆ لەپێشا ووتت خوێندومە، ئێستە ئەپرسی مسیح كێیە؟

وتم: بە صفەتی ئەوە كە جەنابت مبشری، ئەبێ خۆت لە هەمو اعتبارێكی من دور بخەیتەوە، كأنە ئامۆژگاری انسانێكی عامی ئەكەی.

وتی: مسیح علیە السلام پێغەمبەرێكی خودا بوە.

وتم: پێغەمبەر بەكێ ئەڵێن؟

وتی: پێغەمبەر انسانێكە خودا بەهۆی فریشتەی مقربی بارەگای خۆی كە جبرائیلە احكامی بۆ رەوانە ئەكا بۆ ئەوە خۆی و هەركەسێ تابعی ئەبێ بەو أحكامە ڕەفتار بكەن.

وتم: ئەو پێغەمبەرە دەلیلی چییە ئەو مبلغی وەحییە، فریشتەیەكی پاكە، جنۆكەیەكی ناپاك نییە؟

وتی: طبعاً بەهۆی وەرگرتنی احكام لەو فریشتە نور و روناكی داخلی دڵی پێغەمبەرەكە ئەبێ، جوان تێئەگا ئەو ذاتە مقدس و معصومە.

وتم: باشە! خۆی حاڵی بو لە وەضعی ئەو فریشتە، بەڵام كە أحكامەكانی گەیاند بە ئادەمیزاد، بە چ دەلیلێ ئەوان باوەڕ ئەكەن ئەو ذاتە پێغەمبەرە؟

وتی: هەركەس بە فطرەتی پاكی خۆیان لە ڕاستی پێغەمبەرەكە ئەگەن (ل/155)ە بەعزێ كەس داوای خەرق العادە ئەكەن لەو پێغەمبەرە، ئەویش بۆیان إظهار ئەكا، بەعزێ كەسیش لەبەر عناد تابعی نابێ. ئەمە وەضعي پێغەمبەران و ئادەمیزادە لە زەمانی كۆنەوە.

وتم: ئەمانە هەموو ڕاستن، بەڵام شتێكت عەرز بكەم. وتی: بەڵێ.

وتم: طبعاً تۆ اعتراف ئەكەی بەوە كە حضرەتی عیسی لەپاش حضرەتی موسا هاتووە، دینی موسای نسخ كردوەتەوە. وتی: بەڵێ.

وتم: بێگومان بە تاریخ بە تواتری أخبار ئەیش زانی کە محمد المصطفی صلی الله علیه وسلم لەپاش عیسی هاتووە، إدعای رسالەتی عامەی کردوە گەلێ معجزەی دەربڕیوە بۆ ئادەمیزاد. وتی: بەڵێ.

وتم: بۆچی تۆ قەناعەت ئەکەی بە رسالەتی حضرەتی عیسی و نەسخی دینی موسی بەتواتر، بۆچی قەناعەت ناکەی بە رسالەی حضرەتی محمد نەسخی دینی عیسا؟! ئەگەر ئەڵێیت: عیسی بەیانی خلودی دینی کردوە، بەگوێرەی ئەو کتێبە مقدسە لەلای ئێمەدا هەیە، ئەڵێم لەسەر دەعوای یهود (موسی)یش ادعای خلودی دینی خۆی کردوە، بۆچی ئەبێ ادعای خلودی دینی ئێوە بچێتە سەر، إدعای خلودی دینی موسی نەچێتە سەر!! بۆچی ئەبێ ئەو تەواترە کە إثباتی رسالەتی مسیح ئەکا ببێ بە دەلیل بۆ ئێوە، ئەو تەواترە کە إثباتی رسالەتی محمد المصطفی نەسخی دینی عیسی ئەکا نەبێ بە دەلیل.

زیاد لەمانە. هەرچەن لە تواترا پاش عددی تواتر علمی قطعي کەم و زۆری مخبرین مهم نییە، بەڵام تۆ خۆت ئەزانی کە أتباعی حضرەتی مسیح چ لە زەمانی خۆیا، چ لە زەمانی پاش خۆی، هەر بێ دەست و بێهێز بون، غالبا رایان ئەکرد بە کەژ و کێوا لە ترسی یهودییەکان، ژمارەیان زیادی نەکرد لە سێ سەد کەسێ، بەڵام پێغەمبەری ئێمە لەماوەی ژیانی خۆیا تقریباً جزیرة العرب ی هەموو داگیرکرد، إسلامی تیا نەشر کرد، کاتێ وەفاتی کرد ژمارەی اصحابی ئەو لە سەد هەزار زیاتر بوون، سەدەها پیاوی وایان تیابو خاوەن ثقافەی دین بو، گەلێکیان قورئانیان لەبەر بو، ئادابی دینەکەیان بەناو عالەمان بڵاو کردەوە.

عەلاوەی ئەمانە معجزەی عیسی علیە السلام هەر لە زەمانی خۆیا بو، لەپاش خۆی ئاثاری نەما، بەڵام یەکێ لە معجزەکانی پێغەمبەری ئێمە قورئانی معجزە کە بەو فەصاحەت و بەلاغەتەوە ئیعجازی فُصَحای عەرەبی کرد، بەو اسلوب و نەسەقەوە کە لە کەلامی بەشەر ناچێ، بەو اخبارە غەیبیانەوە کە لە باسی زەمانی ڕابوردو زەمانی مستقبل ئەدوێ، بەو تأثیرە ڕۆحییەوە کە هەمو خاوەن وجدانێ وەری ئەگرێ، هەر چۆن وارد بوە، بەو نەوعە دەوامی کردوە و ئەمێنێتەوە.

ئیتر پاش ئەم هەموو دەلیلە بەهێزانە کە اثباتی رسالەتی حەزرەتی موحەممەد ﷺ ئەکا، ئێمە کە کۆمەڵی پەیڕەوانی حضرەتی محمدین، چۆن لە پەیڕەوی ئەو لائەدەین، تابعی یەکێ تر ئەبین، مع العلم ئێمە کە ئوممەتی حضرەتی محمدین ﷺباوەڕمان هەیە بە هەموو پێغەمبەرەکان، بەڵام ئێوە باوەڕتان هەر بە پێغەمبەرەکەی خۆتان هەیە، کەوابو ئێمە مەسئولیەت ڕومان تێناکات، بەڵام ئێوە لە ئیمان نەهێنان بە پێغەمبەری ئێمە مسئولن، بناءاً علیه، جناب ئەگەر انصافت ببێ پێویستە هەر لەسەر روناکی ئەو دەلیلانە کە إثباتی رسالەتی حضرەتی مسیح ئەکا باوەڕ بە رسالەتی حضرەتی محمد المصطفی بکەی، لەم خەیاڵاتە لادەی، خۆت لە مەسئولیەت ڕزگار بکەی.

کابرا پاش (ل/156) ئەم سؤال و جوابە مات بو، ئەوەندە هاتە جەواب وتی: مع الاسف وەخت کەمە، ماوەی ئەوە نییە کە تول بدەین بە قسەکردن.

ئیتر ئێمەیش هەستاین هاتینەوە بۆ تکیە.

لەم مانگا گەلێ جار لە خزمەتی شێخ بابا رسول، مەلا محمد قزلجی دا ئەڕۆیشتینە دەرەوە بۆ ڕابواردن، زۆرتر مەلا محمد مجبوری ئەکرین کە سواری بەلەم بین، بەناو دجلەدا ڕابوێرین، بەڕاستی ئەم سەفەرە لە زۆر ناحیەوە صفابەخش بو، گەلێ شتی وا ئەهاتە پێشەوە کە هۆی خۆشی و پێکەنین بو، بۆ ئەوە ناشێ کە باسی بکەم، من جملە:

ڕۆژێ لەسەر دوکان دانیشتبوین، بەعزێ لەوازمات بکڕین، لەویا ئافرەتێ هات تەکی بە شێخ بابارسول هەڵچنی، ئەویش بە کوردی وتی: خوشکم کچم ئەوە هێشتا تۆزێ دوری لێم، فەرمو بێرە سەر ڕانم دانیشە. ئافرەتەکە هەرچەن لە زمانەکەی حاڵی نەبو، بەڵام لە شێوە قسەکەی گەیشت، جا تۆزێ تەکی دا بەولاوە.

لەپاش جەژنی ڕەمەزان، لەبەر ئەوە مدرسەکانمان ماتڵ بون و من و شێخ بابا رسول اجازەمان لە شێخ وەرگرت و گەڕاینەوە بۆ کوردستان، کاتی ئەم گەڕانەوەمانە هەژدەی شوبات بو، کە گەیشتینە عەبابەیلێ و بیارە دنیا خۆش بوبو،

بینی بەهار ئەهاتە دەماغی ئینسان و وەنەوشە لە چەمی بیارەدا زۆر بو، ئاوی چەم زۆر بو، بەڕاستی صفای ئەو چەم و دۆڵە، خۆشی هەوای وولاتی خۆمان، زۆر بەخێرهاتنەوەی لێكردین:

**بژی خاكی وا پاك و خۆش هەوا**

**خۆشی وا نییە مەگەر لە خەوا**[1]

**ئیتر چاومان بە دیداری یاران روناك بوەوە، ولله الحمد..**[2]

## ئیجازە بەخشینی مودەڕڕیس و بیارە[3]

لە ئاخری بەهاری 1351ك–1932ز مەلا محمد زاهدی كوڕی حاجی مەلا صلاح الدین ی پاوەیی كوڕەزای حاجی عوضی مەشهور، خەلیفەی سراج الدین كە لە اساسەوە منسوبی بیارە بوە، زۆر لە پێش زەمانی مندا لەبیارە خوێندبووی، بۆ تحصیلی علم رۆیشتبو بۆ (گەلاڵە) لە ناحیەی شێن كایەتی لە خزمەتی جەنابی مەلا محمدی رئیس دا خوێندبوی، لەماوەی خوێندنی (تقریب المرام شرح تهذیب الكلام) هاتەوە بۆ بیارە، ماوەیێ لەلای من تهذیبی خوێند، اجازەی وەرگرت.. اجارەنامەكەم خوێندەوە، جبەی كرایە بەر مێزەری لەسەر پێچرا رۆیشتەوە بۆ قصبەی (پاوە)، بە امامەت و تدریس و خطابت لە مزگەوتی گەرەكی (سەردێ) كە شوێنی قدیمی خۆیان بو دامەزرا ولله الحمد..

هەروا مەلا أسدالله ی طالش كە ئەویش ماوەی دو ساڵێ لای من خوێندی لەگەڵ مەلا عارفی طالش دا.. لە عەینی تاریخی 1351ك لەپاش مەلا محمد زاهد اجازەی وەرگرت، لەگەڵ مەلا عارف دا ڕۆیشتەوە بۆ طالش، مەلا أسدالله تا ئێستە بەردەوامە، خزمەتی علم و دین ئەكا، بەلاّم مع الاسف مەلا عارف پاش دوسێ ساڵ لە طالش وەفاتی كرد، رحمه الله تعالی وایانا بمنه.

لەم سالا ماڵمان گوێزایەوە بۆ ئەو خانوانە كە شێخ لەپشتی ماڵی باغچەی خۆیەوە دروستی كردبون.

لەساڵی 1352ك–1933ز نوسخەی عقیدەی هەورامیانەی مرحوم مەلا حامدی كاتبی سراج الدین م پێش چاو كەوت، زۆر لام جوان (بو)[4] منیش وەرم گێڕاوە بۆ زمانی كوردی، بە هۆنراوە وەكو أصلەكەی بە عنوانی (إیمان و ئیسلام) تەواوم كرد، ئەم كتێبە لله الحمد چاپ كرا، گەلێ مندالانی كورد زبان إستفادەیان لێ كرد.

لەمانگی رەمەزانی ئەم سالا لەسەر زەوقی خۆم كە مەیلم لەسەر ژن هێنان بوو. باسی ئامینە ناوی كچی شێخ عەبدوڕڕەحمانی شەمێرانی كوڕی شێخ عەبدوڵلای مرادوەیسی پورزای مەولەوی، خەلیفەی سراج الدینم بیست.

هەر لە ڕەمەزانا لەگەڵ عبید كوڕی حاجی مەلا عبدالله ی شەمێرانی كە هاتبو بۆ بیارە بۆ زیارەت، رۆیشتم بۆ شەمێران، داوای ئەم ژنەم كرد، إجابەیان كرد، هەر لەم سەفەرەدا بەبێ تەفرە مارەیان كرد بووم.

كاتێ هاتمەوە بۆ بیارە، وەچەن رۆژێكی بەسەرا رابورد بیستم كە ناحەز كاری وایان كردوە دڵی ژنەكەیان تێك داوە، نزیكە كە ئیشەكەی من تێك بدەن، منیش رۆیشتمەوە بۆ شەمێران، لە شەمێرانەوە رۆیشتم بۆ دیدەنی سید كاك احمد،

---

[1] لە دەستوسەكەدا نیوەدێڕی دوهەم بەم چەشنە نوسراوە (خۆشی تیا نی یە مەگەر لە خەوا) من پێم وایە وەها راسترە كە من نوسیومە چونكە سیاقەكە سیاقی مدخی تەواوە و بەم چەشنەش لە مەدحی تەواو دەرئەچێ.

[2] مامۆستای مودەرریس لە ل/158 باسی هاتنەوەو شادی قوتابیانی و خۆشی بەهار لەبیارە، بە تایبەت دەنگی خۆشی فەقێیان كە سێ شەممە ەو جمعان دەچنە دەرو بە چەمی بیارەدا بلاّو دەبنەوەو سەد دەكەنە حەیران. پاشان باسی هاتنەوەی شێخی بیارە و گیرانی بەگزادە و پیاوە گەورەكانی هەورامان و جوانڕۆ و مەریوان و بانە، بە دەستی سوپای پەهلەوی یەوە، بەناوی دەعوەت كردنەوەو وەفاتی زۆرێكیان لەم أسارەتەدای بینینی خەوێك بە شێخ مەحمودی حفید و محمد صالح بەگ.

[3] سەرباسی ئامادەكارە.

[4] وشەی (بو) زیادكراوی ئامادەكارە.

سید محمودی تاوگۆزی، كە خزمی ماڵی شێخ عبدالرحمن بون، لەپاش دو سێ رۆژ هاتمەوە بۆ شەمێران، ئیشەكە ئاسان بو، هەر لە شەمێرانەوە نوسیم بۆ بیارە تا مەلا سعیدی مەریوانی كە ئێستە (ل/159) مەلای (سادادا)یە لە مەریوان لەوكاتا لە بیارەدا طالب العلم بو، ئەو ذاتە أسبابی زەماوەندی لە بیارەوە هێنا بۆم بۆ شەمێران، هەر لە شەمێرانا ژنەكەم گوێزایەوە، لەپاش حەفتەیێ هاتمەوە بۆ بیارە، كە هاتمەوە لەم ماوەدا كە من لەم سەفەری شەمێرانە بوم مامۆستا شێخ حیدر لە بیارەدا وەفاتی كردبو، رحمە اللە وطاب ثراە..(ل/162).

## دۆزینەوەی عەشیرەتەكەم[1]

زۆر باسم كرد كە من منداڵ بوم، باوكم –رحمە اللە– وەفاتی كرد، لەپاشان كەوتمە هاتوچۆی فەقێتی، لەم لاو لەولا مەشغوڵی خوێندن بوم، گرانی و جەنگی یەكەمی جیهانی مەیدانی نەدا كە بە ئارەزوی خۆم هاتوچۆی لای خزم و هۆزی خۆم بكەم، بەڵام ئەوەم بیستبو كە باوكی باوكم فتاح كە لە دێی تكیەی لای خورماڵ وەفاتی كردوەو باوكم لەوێ لەدایك بوە، ئێمە عەشیرەتێكی مناسبمان هەیە، باوكی باوكم لە عەشرەتەكەی خۆی دوركەوتوەتەوە، لە دەوری دێی (كەوڵۆس)ەوە هاتون بۆ تكیە، لەپاش وەفاتی باپیرم لە تكیە گوێزاویانەتەوە بۆ (ڕەشان) لەلای شاری پێنجوێن.

بۆ لێكۆڵینەوە لە خزمەكانم ناردم مەلا محمدی كوڕی كریم دەروێش كریم مەلای دێی (بانی بندول) –كە زوتر لە نەرگسەجارا ماوەیێ لە بیارەدا لەلام ئەی خۆند– هات بۆ لام، ئەو ناوونشانانە خۆم بیستبوم پێم ووت، تێم گەیاند بڕوا لەلای ڕیش سپی دەوری كەوڵۆس هۆزی قازی –كە مەلا محمد خۆی یەكێ بو لە هۆزی قازی– پرسیارم بۆ بكات، كە ئەم قسانەم بۆ كرد، وتی: بێ قەزابی، باوكم لەپێش وەفاتیا فەرموی پێم كە مەلا كریمی مدرسی بیارە لەگەڵ ئێمەدا (میرات بەیەك رەواین) لە ئێمەیە، بە هەرحاڵ لە بەهاری ساڵی 1353ك– 1934ز مەلا محمدم نارد بۆ ناو خزمان لە هۆزی قازی، لە (دۆڵی گەڵاڵ)دا تابعی ناحیەی (بەرزنجە).

ئەویش ڕۆیشت بو بۆ ئەوێ، چاوی كەوتبو بە محمد أمینی سبحان برای فقی عبداللە كە دو ڕیش سپی پیر و قەدیمی و ئاگادار لە أحوالی طائفە بون، نەسەبی خۆیان لە نەتەوەی (حسن مەولان) مشهور بە هۆزی هەسەنی بون، لەوێ پرسیاری وەضعی باپیرەی منی كردبو لەوان، لەویا خاڵۆ محمدأمین لە وەڵاما ووتبوی فتاح وەعزیزی برای ظریفەی خوشكیان باوكیان لە هۆزی قازی دایكیان لە هۆزی هەسەنە، لەناو خزمان دەرچون بۆ دەوری تكیە و تازەدێ لەنزیكی خورماڵ، پاش ماوەیێ كە لەوێ مانەوە ئیتر من بێخەبەر بوم لێیان.

لەم بەیاناتی خاڵۆ محمدأمین قسەی دەروێش كریم باوكی مەلا محمد كە موافقی بیسراوەكەی خۆم بو دڵم قەناعەتی كرد.

جا پاش ئەوە مەلا محمد بەم بەیاناتەوە هاتەوە بۆ بیارە، منیش لەگەڵیا سواربوم ڕۆیشتم بۆ دۆڵی گەڵاڵ بۆ (پەریەرۆ) و (مایندوڵ) چاوم بە عەشرەت كەوت، لەپاش كۆڵینەوەی هەندێ سەرگوزشت و بەڵگە لەیەك ئاشكرابوین، بەڵام تا من ڕۆیشتم بۆ ئەوێ خاڵۆ محمدامین سوبحان وەفاتی كردبو رحمە اللە.

لەو دەما لە هۆزی قازی مامەشاوەیس، مامەقادر، محمد جمیل و فتاح و طالب كوڕانی محمد علی، كوێخا شریف كوڕی مامەشاوەیس، مەلا موحەممەدی مەحمود مراد، برایم، صاڵحی كەرەم وەیس، گەلێ پیاوی تر لە (مایندوڵ) بون، لە نەفسی مایندوڵ موحەممەدی جمیل كوڕی خاڵۆ محمدامین، عارف و فارس كوڕانی كاكەحمە كە باوكیان لە هۆزی هەسەن دایكیان (وەنەوش) ناو لە ووردەشاتری بو، وەزاوای مامەشاوەیس بون لە (مایندۆڵ) بون، هەروا لە (پەریەرۆ) كوێخا فەرەجی موحەممەد ئەمین كَێخَسرەو (ل/163) گەلێ پیاوی ترم چاو پێكەوت، لەدێی (توتاغاچی) موحەممەد عەلی وەیس، لەدێی (كێلەكەوە) عارفی مەلا محمد خان، لە دێی (وەڵەسمت) حمەی صادق كریم ی صادق كە ئەمانە لە هۆزی قازین چاووم

[1] سەرباسی ئامادەكارە.

پێیان كەوت بە خزم ناسراین.

پاش ئەم تاریخە هەمو ساڵ لە بەهارا ئەم خزمانە چەن سوارێكیان لەگەڵ هەردوو مەلا موحەممەددا، یانی مەلا موحەممەدی مەحمود مراد مەلا موحەممەدی دەروێش كەریم، یا هەر مەلا موحەممەدی مەحمود مراد ئەهاتن بۆ دیدەنی من بۆ بیارە، منیش لە بەهارا یا لە پایزا دیدەنی ئەوانم ئەكرد، تا ئێستەش كە گەلێ لەمانە وەفاتیان كردوە، گەلێكیان ماون، حجیان كردوەو لە مایندوڵ دەرچون، لە سید صادق و خانەقەویلە لە پشتی سەرچاوەی سەراوی (سبحان ئاغا) دانیشتون، ئەم رشتەی محبەت و دۆستی خزمایەتیە بەهێزتر دەوام دارتر بووە.

لەو بەهارا كە هاتمەوە بۆ بیارە (عبدالله فتح الله) كە یەكێ لە خزمانی هۆزی قازیە، لەوكاتا پۆلیس بوو لە مەركەزی (پشتە) لەوبەری سیروانەوە نقل كرابو بۆ بیارە، لەگەڵ ئەوانیش ناسراوی كەوتە بەینمان لەیەك ئاشنابووین، والحمدلله.

## وەضعی خۆم و یەكەمین خوتبە بە كوردی[1]

لە موسمی پایزا لەم ساڵا شێخ بە یاسای خۆیان تەشریفی ڕۆیشت بۆ شاوەیس و باوەیس بۆ سەر مەرەزە، ماوەی مانگی لەوێ مایەوە وەجا لەو كاتا لەمانگی رەجەب دا ئەم نامەیە نوسی بۆم بۆ بیارە[2] كە هەموو رۆژێكی جمعە مەعنای خطبەی ڕۆژی جمعە بەزمانی كوردی بەیان بكەم بۆ مسڵمانان بۆ ئەوە هەمو لە مانای خطبەكان حاڵی بن، منیش لەو تاریخەوە ئەم دەستورەم بەجێ هێنا، جا لەدێی تەوێڵە، خورماڵ، هەڵەبجە، باقی شوێنەكانا ئەم یاسا دامەزرا. (ل/ 168).

لەم ساڵی 1353ك–1934ز لەمانگی جمادی الاولی لەكاتی طلوعی صوبحی جمعە لە دوهەمی مانگا (عالیە) ناوی كچم لە ئامینەی كچی شێخ علی لەدایك بو–خودا بە لوطفی خۆی ئەنجامی خێر بكات– امین.

وە لە زستانی ئەم ساڵا كە هەزار و سێصەد و پەنجا وسێ بو رسالەیێكم لە علم ی منطقدا بە عنوانی (مفتاح) تالیف كرد، ئەم رسالە هەرچەن كورتە، إبتدائیية، بەڵام مضبوط و جوانە، گەلێ طلبە نوسیانەوە و خوێندیان.

هەر لەم ساڵا أسعدی كوڕم.. وەفاتی كرد.. بە واسطەی مردنی أسعدی كوڕمەوە دڵم زۆر مەلول بوو، اشتیاقی دڵم بۆ فاتح–كە برای ئەوبو، ئەویش لەماڵی باپیری بو– زۆر غلبەی كرد لەسەرم، جا لەبەر ئەمە لە ئەوەڵی پایزا قەرارم دا كە بڕۆم بە شوێنی فاتح دا، دەبێ بیهێننەوە بۆ بیارە، لەلایێكەوە بەڵكو بە چاوپێكەوتنی ئەم دڵم ئارام بگرێ، لەلایەكەوە فاتح عومری گەیشتبو بە دەوری هەشت ساڵ، ویستم وردە (وردە) دەستی پێ بكەم بە خوێندن شتێ بخوێنێ.

لەسەر قەراری پێشو لە پایزا لە تاریخی 1354ك–1935ز دا كەوتمە ڕێگە بۆ (باوەجانی) بەشوێنی فاتح دا، بەتایبەتی لەساڵی 1353ك دا پاش (ل/169) وەفاتی مەلا عبدالله ی باپیری ڕۆیشتم بەشوێنیا لەبەر منداڵی نەیان دامەوە، ئیتر ئیمساڵ بەجدّی ڕۆیشتم بەشوێنیا لەماڵی باپیری هێنامەوە.

لەم سەفەرا كەوتمە خەیاڵی ئەوە كە (دولت نامە)ی مەلا خضری روداری كە بەزمانی هەورامیانە نوسیویەتی تەرجمەی بكەم، بەكوردی نظمی بكەم، فعلاً كە لەم سەفەرە هاتمەوە دەستم كرد بە ترجمەی ئەو كتێبە بە عنوانی (إقبال نامە) تەواوم كرد.

هەر لەم ساڵا كتێبی (أساسی سعادەت) بەشێوەی سؤال و جواب بەزمانی كوردی لەباسی أصل و فرعی دینا نوسیم، پاش ئەم كتێبە كتێبی (بارانی رەحمەت) بەزمانی كوردی هۆنیمەوە، لەنزیكی چوار هەزار و كسور شیعرا، تەواوم كرد،

[1] سەرباسی ئامادەكارە.

[2] ل/168 نامەكەی تێدایە.

ئەم سێ کتێبە هەرسێکیان چاپ کراون.. (ل/170)[1]

لەساڵی 1354ك و 1355 دا قەرەباڵغی طلبە لەبیارەدا زۆر بو، گەلێ لەوان مستعد و خاوەن قابلیەت بون، شێخ زۆر احترامی دەگرتن حەتا لەبەر دەنگ و غەوغایان جارێ صۆفیەکانی خانەقا شکاتیان لەلا شێخ کرد، کە ئێمە لەبەر دەنگی طلبە، مەشغولیمان بۆ ناکرێ. شێخ بەرامبەر بەم شکاتە ئەوەندەی فەرمو: کە من طلبەکانم منظورترە، چونکی ئەبن بە مەلا نەشری دین ئەکەن، کەوابێ هەرکەس لە ئەهلی خانقا بەدەنگی فەقێ مشغوڵی لێ تێك ئەچێ کەیفی خۆیەتی دائەنیشێ دابنیشێ، ئەڕوا بڕوا.

ئەم إعلانی شێخە زۆر تأثیری کرد، زۆر حورمەتی دا بە طلبەی علم، لەپاشا کەس معارضەی طلبەی نەدەکرد، لە عەینی حالاً ئەم طلبانەیش مساعدەی صۆفیەکانیان ئەکرد، لەبەر ناچاری نەبوایێ، کاری وایان نەدەکرد ئەوان عاجز بن.

لەهاوینی ئەم دو ساڵانە طلبەی مدرسەو خانقا عددیان لەصد کەس نزیك ئەبوەوە، شێخ قەراری دابو عمری چەن ساڵ بێ، لەسەر ژمارەی ساڵی عمری طلبە لە مدرسەدا ڕابگرێ، بێجگە لەو طلبانەیش کە لە خانقادا دائەنیشتن، بەنان و شۆربای خانەقا قەناعەتیان ئەکرد، بۆ ئەوە دەرسیان دەسکەوێ، لە واقعا خوێندنی باشیان دەست ئەکەوت، چونکی هەمیشە مستعدی باش لە مدرسەدا زۆر بون، ئەم مستعدانە هەریەکێ عددێ لە سوختەکانیان بۆ دەرس پێ ووتن چاودێری ئەکرد.

لەساڵی 1355ك–1936ز. دا حاجی ئیسماعیل ناوێ لە میصرەوە هات ماوەی سێ مانگ لە بیارەدا مایەوە ئێمەش بۆ ئەوە ئەو هەلە لەدەست دەرنەچێ، طلبەکانمان هەموو ڕۆژێ بە حلقە حاضر ئەکرد تا تەواو قورئانیان بە تجوید لە خزمەت حاجی ئیسماعیلدا خوێند.

لەڕۆژی خەتمی قورئانی پیرۆزا شێخ لەبەرهەیوانی مەرقەدا حاضر بو، زۆر لە ئەهلی خانەقا، مامۆستا بهاءالدین منیش حاضر بوین، بەڕاستی بەرەکەتی ئەو مجلسە ئەوەندە زۆر بو هەمو کەس دەرکی ئەکرد، ڕۆژێکی دیاری بو لە ڕۆژانی حەیاتمانا بۆ پیرۆزی و خۆشی.

لەزستانی 1355ك–1937ز مەلا موحەممەدی مامۆستا مەلا بهاءالدین لە خزمەتی شێخ بابا ڕەسوڵدا هاتن بۆ بیارە، بۆ ئەوە کە لە بیارە إجازەی پێ بدا، لەو وەختا منیش ئەمویست إجازە بە جەنابی سید حسام الدینی مکریانی بدەم لەبەر ئەوە کە ئەمان ویست مەلا محمد ببێ بە مەلای دێی

بیارە، هەموو ڕۆیشتین بۆ مزگەوتی بیارە، لەپاش عصر لەیەك مجلس دا لە مزگەوت شێخ بابا رسول إجازەی مەلامحمدی خۆندەوە، منیش اجازەی سید حسام الدین م خوێندەوە، جبە و عەمامەیان پۆشی (ل/173).. لە آخری بەهارا إجازەم دا بە سید بهاءالدین برازای سید محمد صادق خورخوڕەیی شاعری مەشهور متخلص بە (هەیبەت)..

وە لە پایزی 1356ك–1937ز مەلا خدر خەڵکی (ئاڵوت) لەناحیەی ئالان إجازەی وەرگرت، ڕۆیشتەوە بۆ وولاتی خۆی، ئەم ذاتە زۆر صالح خاوەن تقوی بو.

وە هەر لە آخری ئەم ساڵەدا، مەلا شێخ احمدی خەڵکی (واشەمزین) تابعی سەردەشت إجازەی وەرگرت، ڕۆیشتەوە، ئەم ذاتە برازای مەلا عمر واشەمزینی بو، ئەم دوو ذاتە یەکی ماوەی دوو ساڵ لە بیارە مانەوە، مع الاسف هەردوکیان بەجوانی متوفی بون–إنا لله وانا الیه راجعون–.

لەم ساڵی 1356ك–1937ز بو کە کتێبی (شمشیرکاری) بر فرق نسیمی رستگاری)م بەزمانی فارسی تالیف کرد، ئەم کتێبە لە ڕەددی شێخ محمد مردوخ مشهور بە آیت الله خەڵکی (سنە) تالیف کرا، چونکە بە عنوانی (نسیم رستگاری) رسالەیێکی تالیف کرد بو لە ڕەددی تقلید وإجتهادا، کە کتێبەکە بڵاو بوەوە، منیش بە عنوانی سابق ڕەددم کردەوە.

[1] نامی باسی وەفاتی خێزانی شێخ عمر ابن القردلغی دەکا و سێ نامەی ئەوی هێناوەو باسی ژن خواستنی نوێ و وەفاتی شێخ عمر دەکا و بەم شعرە غەمی خۆی دەرئەبرێ: طالبان غومبار، دنیای بەجێ هێشت، فریشتەی دڵ شاد کە چو بۆ بەهەشت.. پاشان باسی ئەوە دەکات کە لەم ئافرەتە کوڕێك لەدایك بو، لەسەر وەصیەتی شێخ ناونرا (بابەعەلی) و پاش تمیز وەبەر خوێندن نراو موفق بوەو بوەتە مەلای مزگەوتی بن تەبەق.. بنواڕە (ل/170– 172).

## لەساڵی 1938ز تا 1950ز[1]

**لەمانگی محرم ساڵی 1357ك-1938ز محمد نجیب لە آمنەی کچی شێخ عبدالرحمن لە بیارەدا لە مەوسمی بەهارا لەدایك بو، خوا موفق و عاقیەت خێری بکات.**

**لەم ساڵی 1357ك-1938ز مەلا محمود وەیسەیی، مەلا علی جوانڕۆیی، شێخ عمر عزی خەڵکی (دیر الزور) لە سوریا، ئەمانە إجازەیان وەرگرت.. (ل/175).**

**هەر لەم ساڵا شێخ محمد مەردوخ بە عنوانی (جان نما) کتێبێکی نوسی بلاوی کردەوە، گەلێ شتی پڕوپوچی اعتقادی تیانوسی بو، منیش بەزمانی فارسی بە عنوانی (شهابی سما) در رجم جن جا نما، کتێبێکم لە ڕەدیا نوسی، بەڵام لەبەرئەوە شێخ محمد تۆزێ... شۆرەتی... دامردەوە، من نەم ویست کتێبەکەم چاپ بکەم.**

**پاش ئەمە بە عنوانی (یزدان و إهریمن) رسالەییێکی منظومەی نوسی لە محاکمەی خوای تعالی لەگەڵ شەیتان، لەم رسالەدا زۆر شتی بێ معنی و خراپی نوسی بو، منیش بە عنوانی (فیوضاتی خدای ذي من) رسالەییێکم بەفارسی لە ردّی ئەو رسالەی ئەوا نظم کرد، ئەمەیش چاپ نەکراوە.. (ل/177)**

**لە ساڵی 1358ك-1939ز مەلا محسن ئەڵمانەیی و مەلا سعیدی بالکی ئیجازەیان وەرگرت...**

**لەساڵی 1358ك-1939ز) دا کتێبی (ئاوی حەیات)م بەنثری کوردی نوسی لە تەرجەمەی ئەحواڵی ئەو پێغەمبەرانە کە لە قرآنا ناویان هەیە، دواییم هێناوە بە باسی عشرەی مبشرە، أئمەی أربعەی مجتهدین رضي الله عنهم أجمعین، ئەم کتێبە لله الحمد چاپ کراوە، گەلێ محسن إستفادەیان لێکردوە.**

**لەساڵی 1359ك-1940ز[2]دا کتێبی (چل چرای ئیسلام)م نوسی، ئەم کتێبە کوردیە، نثرە، شەرحی چل حدیثە لە أحادیثی حضرەت صلی الله علیه وسلم.**

**هەر لە ساڵی 1359 ك دا مەلا محمد أمین ی موکریانی، شێخ محمدی کوڕی شێخ معروفی نەرگسەجاڕی إجازەیان وەرگرت (ل/178).**

**لەساڵی 1360ك-1941ز لە شەوی یەك شەممەی بیست و سێی مانگی محرم لەکاتی بەهارا صلاح الدین لەدایك بو، لەخوای أرحم الراحمین داوا ئەکەم کە بە فەضلی خۆی موفقی بکات ئەنجامی بەخێر بێنێ.**

**هەر لەم ساڵا بوو کە مەلا مجیدی کانی ساردی وارماوایی إجازەی وەرگرت، هەر لەم ساڵا مەلا قادری کوڕی أحمدی فتاح هارونی خەڵکی پیوان، مەلا أحمدی کوڕی صوفی محمودی کوێرەکی إجازەیان وەرگرت.**

**هەر لەم ساڵا لە امنەی کچی شێخ عبدالرحمان کوڕێکمان بو، ناومان نا جلال، زۆر جوان بو، بەڵام پاش چل رۆژی وەفاتی کرد، لەخسنی پشتی مامۆستا شێخ حیدرەوە لە ملگای چنارا دەفن مان کرد.**

**لەساڵی 1361ك-1942ز لە مانگی شەهروەری فارس دا، لە ئەنجامی جەنگی دووەمی عالەمی وەزعی رەضاشای بەهلەوی تێك چو، پیاوە کوردە دیلەکان-ئەوەیان مابون- هاتنەوە بۆ وڵاتی خۆیان.**

**لە بەهاری ئەمساڵا لەگەڵ فاتحی کوڕما رۆیشتم بۆ دیدەنی رابعەی خوشکم لە (دوروە)، لەوێوە رۆیشتم بۆ (ئەڵمانە) بۆ دیدەنی حاجی سید باباشێخ، بۆ (چور) بۆ دیدەنی سید عابدین، لەوێوە دیدەنی (ملا باقر)م کرد لە (بالك)دا، لەگەڵ ئەوا رۆیشتم بۆ دیدەنی محمد سعید بگ ی فتاح بگ، منداڵەکانی محمد صالح بگ ی برای، لەگەڵ ئەوان رۆیشتم بۆ دیدەنی محمود خانی کانی سانان کە لە (قەڵا)دا بو، پاش ئەوە گەڕاینەوە بۆ (بالك) دووشەو لە (بالك) بوم، جا گەڕامەوە بۆ بیارە.**

---

1 سەرباسی ئامادەکارە.

2 مامۆستای مدرس ئەم تاریخەی بە (49ك) نوسیوە، دوای لێکۆڵینەوەو بە سیاقی نوسینەکە لام معلوم بو کە (59)یە، نەك (49).

ئەم سەفەرە زۆر خۆش خاوەن صفا بو بەتایبەتی ئەو شەوانە لە (بالك) دا بوم، گۆرانی وێژی دەنگ خۆش گۆرانیا ن ئەوت زۆر تأثیریان ئەکردە دڵی ئینسان، زەمانی قدیمی صوحبەت ی ڕەفیقان ی ئەخستەوە بیری انسان..(ل/180).

هەر لەساڵی 1361ك-1942ز مەلا علی کوێرەکی، مەلا محمودی کانی بەردینەتی إجازەیان وەرگرت، مەلا علی ڕۆیشتەوە بۆ ماڵی خۆیان بۆ کویرەك، مەلا محمود ڕۆیشت بۆ دێی (عَنَب) لەوێ بویە امام و مدرس تا ئێستە لله الحمد ماوە موفقە لەسەر خزمەتی دین[1].

هەر لەساڵی 1361ك دا لە ئامینەی کچی شێخ عبدالرحمن کوڕێکمان بو ناومان نا بە عبدالقادر، لە قضاو قدر لە بیستی مانگی ربیع الثانيدا فراق کەوتە بەینمان تەلاقم دا، کوڕەکەی بەجێ هێشت، لەلای دایەن لە بیارە وەفاتی کرد، لەگەڵ باقی مناڵەکانا لەخسنی پشتی قەبری مامۆستا شێخ حیدرەوە دەفنمان کرد .

لە غەمی فراقی ئەم عائلەما، پەرێشانی حاڵی خۆما ئەم شعرەم لە پشتی رسالەی حسابەکەمەوە نوسی:

میل کردم که غم دهم برباد

باد گفتا غم تو سنگین است

وە لە ساڵی 1362ك-1943ز دا مەلا فتاحی شاتری، مەلا صالحی کوڕی سۆڤ عەبدولقادری صۆڤ خودا بەخشی ژاڵە ناوی (وەلی) إجازەیان وەرگرت...

هەر لەم ساڵا بە عنوانی (نامەی حقیقت) کتێبێکی کوردی م بە نظم تألیف کرد لە باسی گەلێ مسائلی مشکلەی دین، بەشێوەی پرسیار و وەڵام دانراوە، ئەم کتێبە دەوری دو هەزار شیعرە و تائێستە چاپ نەکراوە.

لەساڵی 1361ك-1944ز دا فصلی بەهار شەوی شەممە سەعات نۆی عەرەبی (عطیة)ی کچم لەدایك بو خودا عاقبەتی خێر بکات.

وە لەم ساڵا کتێبی (باغچەی معرفت) بە نثر و نظم لە باسی خوڕەوشتی بەرزا نوسیم، هەر لەم ساڵا شرحی (تصریفی زنجانی) بەکوردی نوسیم، هەر لەم ساڵا رسالەی (العلمان في علمین) لە باسی وضع و استعارەدا تألیفم کرد.

وە لەساڵی 1363ك دا مەلا صدیقی کوڕی خلیفە مەلا رحیم ی هەوشاری إجازەی وەرگرت ڕۆیشتەوە بۆ وڵاتی خۆیان.

لە مانگی مەولودا شێخ بابارسول مدرس عەبابەیلیێ، سەرگەورەی مەلایانی قضای هەڵەبجە لە عەبابەیلێدا وەفاتی کرد، بە وەفاتی ئەم ذاتە وەکو ڕۆژ ئاوابێ یا لە هەورێکی ڕەشا ون ببێ، وەها وەضعی مەلایان لە قەزای هەڵەبجەدا تێك چو ڕۆژیان ڕەش بو، ڕشتەی هۆنراوەی مەلایانە کە بابارسول امامی بو بچڕایەوە.. دنیای هەموو لایێ گۆڕا، سبحان من یغیر ولا یتغیر...(ل/181).

لەساڵی 1364ك-1945ز مەلا سعیدی گڵەجاڵی، إجازەی وەرگرت.. لەپاش وەفاتی شێخ بابارسول بە موددەتی چەند مانگێ مەلا مەجیدی وەلد بەگی هات بۆ بیارە رسالەی حسابی بهاءالدینی عاملی خوێند، إجازەی وەرگرت.

لەساڵی 1367ك-1946ز چەند مانگێ فاتح محمدی کوڕم لە بیارەوە ڕۆیشتن بۆ عەبابەیلیێ، لە خزمەتی مەلا حسن ی عەبابەیلیێدا خوێندیان، لەپاشان هاتنەوە بۆ بیارە، لەساڵی 1368ك-1947ز فاطمەی کچی شێخ محمدی شێخ علی خەزورم مارەکرد بۆ فاتحی کوڕم، مەلا و فەقێ ی قەزای هەڵەبجە هەمو هاتن بۆ شادی، زۆر خۆش زەماوەندەکە تەواو بوو، فاتح لەم فاطمە ناوە دوو کچی بو، نافعە و نعیمە، هەردو بەشوێن یەکا وەفاتیان کرد، جا فاطمەی دایکیشیان وەفاتی کرد، رحمها الله، وەفاتی فاطمە 1370ك دابو.. (ل/182).

لەساڵی 1368ك-1948ز دا مەلا محمدی کوڕی مەلا احمدی هەوشاری مەلا محمد امین ی بانەیی، مەلا عبدالقادری خۆشناوی یەك لەدوای یەك إجازەیان وەرگرت.

هەر لە ساڵی 1368ك-1949ز دا مامۆستا مەلا بهاءالدین.. لە مانگی شعبان متوفی بو، رحمه الله وطاب ثراه.

[1] مەبەستی کاتی نوسینی ئەم پەرتوکەیە کە لەساڵی شەستەکاندا نوسراوە.

لەساڵی 1369ك – 1949ز دا مەلا عزیزی پریس كە لە طائفەی هۆزی هەسەنە.. وەفاتی كرد رحمه الله وطاب ثراه.

بە وەفاتی ئەم ذاتەیش ئەو تۆزە خۆشییە اجتماعیە كە لەناو مەلایانی قەزای هەڵەبجەدا مابو ئەویش روی كردە نەمان، بەڵكو بالفعل نەما.

وە بە وەفاتی مامۆستا مەلا بهاءالدین وەزعی خانەقای بیارەیش روی كردە ضعیفی، چونكە پیاوێكی وەك ئەو كە لە اموری ختم و تهلیلەدا سەرامەد بێ نەما، رۆژ بەرۆژ وەضع بەرەو تاریكی ئەڕۆیشت، انا الله وانا الیه راجعون.

لەساڵی 1370ك–1950ز دا شێخ نجم الدین كوڕی شێخ عبدالقادر ی حەوتاشی كە لە نەتەوەی خلیفە روستەمی حەوتاشین، منسوبی بیارە بو، لە بیارەدا ئەی خوێند تەواوی كرد، إجازەی وەرگرت رۆیشتەوە بۆ وڵاتی خۆیان، ئەمە اخر طالب علم بو كە لە بیارەدا إجازەی لەلای من وەرگرت.

دەورێ بو دیمان بەدیمەن بەهەشت
وێنەی گوڵزار بو كێو و سارا و دەشت
لەلایێ شنۆی نەسیمی سەحەر
لەلایێ شێوەی دۆستانی دڵبەر[1]
بابا رسوڵ و شێخ عبدالكریم
مەلا عبدالله عابدی سلیم
مەلا عزیز و مەلا شێخ شێخ عمر
مەلا شێخ رسول زانای مُنوّر
لەگەڵ یارانا لە دەستە و بەستە
ئەبون بە دەرمان بۆ دڵی خەستە
كاتێ بۆ دیدەن گرد ئەبونەوە
بە صەفای سینەی خۆش نمونەوە
ئەت ووت كۆمەڵا لە فریشتەكان
هاتون بە ئەمری خودای لامەكان
كۆیان بە وێنەی ئەستێرەی كۆبو
بۆیان بە وێنەی عەطری شەوبۆ بو
رویان بەدیمەن بە وێنەی گوڵ بو
بۆیان شەونمی لاپەڕەی دڵ بو
ووتاریان باسی وحی خدا بو
ڕەفتاریان شێوەی رسول الله بو
نمونەی چرای رێی عنایەت بون
وێنەی ئەستێرەی رێی هیدایەت بون
كاتێ لە حوجرەی مدرسەی ضیا
ئەكەوتنە صوحبەت وێنەی ئەصفیا
مجلس پڕ ئەبو لە ذەوق و مەعنا

[1] نامی لێرەدا هێمایەكی كردوەو ئەم شەش بەیتەی دوایی نوسیوە ل:183.

**جلیسیان بەدڵ ئەیووت سمعنا**

**لەلایێ باسی عەقڵ و علم و دین**

**لە لایێ خولْك و ڕەوشتی شیرین**

**جێ جێ لە باسی یارانی سەربەست**

**جێ جێ لە باسی دڵبەری چاومەست**

**جارجار هەر نوكتە و گەپ و مەزاح بو**

**باسی عوشرەتی مەسا و صەباح بو(ل/183)**

**سالاْ بە وێنەی ساتێ بو لەلات**

**لەدڵ دەر ئەچو ئێشی مشكلات**

**باسی شەرابی قورئانی عظیم**

**لا فیها غول (تا) ولا تأثیم**

**وێنەی شەرابی حُبی یارانە**

**نیم نیگای چاوی چاو بیمارانە**

**ئاخ ئەم یارانەم نەئەدی بەچاو**

**نە بە بێداری نە بەكاتی خاو**

**یا بەر لە یاران ڕێم ئەگرتە بەر**

**بێ سۆزی سینە و بێ جەفای جگەر**

**ئێستەیش كە قەزا عەكسی مرادە**

**(نامی) بەیادی یارانی شادە[1]**

**... مردنی هەركام لەم مەلایانی قەزای هەڵەبجە، وەیا نەمانی هەركام لەم شەخصانە كە لە بیارەدا موظف بون، ئەبو بەهۆی پەرێشانی تێك چونی ئیش و كاری بیارە، لەسەر ئەم ئەساسە بە وەفاتی شێخ عبدالكریم ی احمد بڕندە زیانێكی گەورە كەوت لە ڕشتەی علمای قەزای هەڵەبجە، بەتایبەتی بە وەفاتی شێخ بابا رسول وضعی علمای هەڵەبجە، وەضعی بیارەیش روی كردە انحطاط، لەم لایشەوە بەهۆی هەنێ ئەسبابی دڵگرانیووە لەپاش وەفاتی بابارەسول، بەتایبەتی لە ساڵی 1364ك–1944ز دا سید مظهری كاتبی شێخ كە وەكو دەستی ڕاستی بو دڵی لە بیارە هەڵكەنرا، كەوتە محاوەلەی دەرچون لە بیارە، بە عەلاوەی ئەوە رۆژ بەرۆژ ووردە وەزعی عائلەوی بیارە، پیربونی شێخی بیارە، زۆر هێنانی ضعیفی كز بونی حواسی گوێچكە و چاو و صحەتی بەدەنی، وەختە بڵێم هەر بەناو بیارەی هێشتبووەوە.**

**وە لەو سەردەما نەخۆشی سڕبونی أعضا، ناساغی فقر الدم شێخ عثمانی كوڕی شێخی داگیر كرد، زۆر وەخت بیارەی بەجێ ئەهێشت بەهۆی تداوییەوە ئەچو بۆ كركوك بغدا..**

**لەبەر عەینی أسباب وەضعی مدرسەی بیارەش تێك چو، زۆر سەرزەنشتی شێخ ئەكرا كە ئێمە قەرزار و بێدەستین ئەوندە طلبەمان بۆچییە، ژمارەی فەقێ لە پایەی شەست و حەفتاوە هاتە خوارەوە بۆ دەو دوازدە، ئەویش هەر بەجوانی تەماشا نەئەكران، وەتا لەم دوازدەیە نەڕۆیشتایە، فەقێیەكی تر راگیر نەدەكرا، مع العلم ئەوسا (لاردّ) و (لاعدّ) بو، منیش**

[1] لەدوای ئەم شعرانە نامی دەس دەكات بە باسی زانایانی هاوچەرخی خۆی و سەرگوزشتەی مەلایانی قەزای هەڵەبجە دەنوسێ و بەسەرهاتی شێخ مصطفی‌ی مفتی هەڵەبجە و شێخ عبدالكریمی احمد بڕندە و شێخ بابا رسولی بیدەنی و شێخ عبداللطیفی قازی هەڵەبجە و مەلا محمد سعیدی عەبابەیلێ و مەلا عزیزی پریس و مەلا عابدی عەبابەیلێ و مەلا حەسەنی عەبابەیلێ و مەلا عبداللە ی دەرە شیش و مەلا محمدی عەدلەخان و مەلا محمدی كوڕی مامۆستا مەلا عبداللە و مەلا عبداللە ی باڵەكی و... دەهۆنێتەوەو هێندەی تر كتێبەكەی پێ دەوڵەمەند دەكات و ل/184–202ی پێدەڕازێنێتەوە.

هەروا وەضعی خۆم تێك چو، ئەم ویست هەڵێ هەڵ کەوێ دەرچم، بەڵام پیری شێخ مانع بو لەوە کە دڵی متأثر بکەم، إقدام نەئەکرد، بەڵام سید مظهر و سید نظام لە 1365ك باریان کرد، بە هەرحاڵ مامەوە..

لەلایەکەوە شێخی بیارە پیر و ضعیف الحواس بو، رۆژ بەرۆژ صحەتی انحطاطی ئەکرد، لە امکانیا نەما وەکو سابقی خۆی تماشای وضعی خانقا و مدرسە و متعلقین بکا، لەلایەکەوە ووردە ئەولاد گەورە بوبون، مەشرەبیان مخالفی مشرەبی قدیم بو، استیلای پیری شێخیان کردبو، بە ئارەزوی خۆیان ئەیانویست رەفتار بکەن.

## دەرچونم لە بیارە[1]

تا لەبەهاری 1370ك–1951ز لە مانگی رجب دا سۆی تفاهم لەناوبەینی زاهدی کوڕی شێخ و مناڵەکانی منیشا پەیدا بو، لەوکاتا شێخ عثمان لە بیارە نەبو، رۆیشتبو بۆ ناحیەی جوانڕۆ، ترسم پەیداکرد ئەگەر ئەو وەزعە دەوام بکا، من لە بیارە دەوام بکەم ممکنە فیتنەیێ پەیدا ببێ، لەسەر ئەم أساسە بڕیارم دا کە لە بیارە بگوێزمەوە، فعلا مناڵەکانم لەو ماڵا کە خۆم تیابوم زۆر زحمتم تیایا کێشابو، بەجێم هێشت، لەسەر (بورج) کە لەو رۆژا بەدەستی کوڕانی ئەفراسیاو بەگەوە بو، دو هۆدەم وەرگرت مناڵەکانم تیایانا دانا، خۆم حاضر کرد بۆ نقڵ کردن (ل/204).

کاتێ شێخ لەسەر ئەم وەزعە خەبەردار بو ناردی بە شوێنما گەڵێ فەرمایشتی فەرمو، کە فَكّی ئەو إرادە بکەمەوە، بەڵام لەبەر ئەوە کە من ئەمزانی شێخ اختیاری لەدەستا نەماوە، ئیمرۆ یا سبەینێ قابیلە ئاشوبێ پەیدا ببێ، بۆ خۆپاراستن لە ئاشوب لەسەر إرادەی خۆم دەوامم کرد.

وە رۆژی دوو شەممە بیست و پێنجی مانگی رجب ی 1370ك–1951ز لە بیارە دەرچوم بۆ هەڵەبجە، دوو شەو لە هەڵەبجە مامەوە، رۆژی پێنج شەممەی 26/ رجب لە هەڵەبجەوە رۆیشتم بۆ سلێمانی، لە مزگەوتی حاجی شێخ امین ی خاڵ بوم بە میوانی شێخ محمدی خاڵ قاضی سلێمانی.

مع العلم لەوکاتا لە هەڵەبجەدا بوم شێخ (حاجی فەرەجی صوّفی سعید) کە منسوبێ بو، بیارەیی بو ناردی بە شوێنما بۆ هەڵەبجە، بەڵام لەبەر عەینی اسبابی پێشوو نەگەڕامەوە بۆ بیارە.

پاش چەند رۆژێ لە سلێمانییەوە کەوتمە رێگە بۆ بغدا، بۆ ئەوە کە لەگەڵ مدیری ئەوقافی عام ملاقات بکەم، ئەو جوزئی معاشە کە لەسەر وظیفەی خطابت لە بیارەدا وەرم ئەگرت بمدەنێ، لەلایەکیشەوە جهەتی تدریس لە مزگەوتی (حاجی أحان) شاغر بو، ویستم کە سعی بکەم إعلانی شغوری بکەن، داخڵی إمتحان ببم بۆی، بەڵکو ئەو جهەتەیشم دەست بکەوێ، لە سلێمانیدا دامەزرێم.

کە لە سلێمانی یەوە گەیشتمە کەرکوك رۆیشتم چاوم کەوت بە متصرفی کرکوك شێخ مصطفی قەرەداغی کە ناسراوی سابقم بو، ئەویش کاغەزێکی نوسی بۆم بۆ لای موسی شاکر کە لەو رۆژا مدیری ئەوقافی عام بو، فعلاً هاتم بۆ بغدا، ملاقاتی مدیری عامم کرد، ملاقاتی عیسی عبدالقادرم کرد، لە مقصودەکانما ناجـــح بوم، هەم مەعاشەکەم بۆ قەرار درا لە هەر لایێ ببم، چونکە ذاتی بوو، ئیعلانی شعوری جهەتی تدریسی مزگەوتی (حاجی أحان)یش کرا، گەڕامەوە بۆ سلێمانی پاش چەند رۆژێ داخلی امتحانی تدریسی مزگەوتی حاجی حان بوم، ناجح بوم، لە لایەنی هیئەتی علمیەوە ئەوراقی امتحانەکەم نێررا بۆ بغدا تا لە مانگی شوالی ساڵی 1370ك دا مصادفی مانگی تموزی 1951 میلادی ئیرادەنامەی تدریسم گەیشتە سلێمانی، قاضی شێخ محمد احتفالێکی بەرزی پێك هێنا لە أشرافی سلێمانی علما شەربەت خۆری کرا، لەسەر وەظیفەی تدریس لە مزگەوتی (حاجی أحان) دامەزرام، لەم ماوەدا کە دو مانگ و چەند رۆژێ بو هەر میوانی قاضی شێخ محمد بوم لەلایەنی خۆیو براکانیەوە: شێخ احمد شێخ مصطفی زۆر خزمەتم کرا، جزاهم الله عنا بفضله

[1] سەرباسی ئامادەکارە.

آمين.. (ل/205)

لەم ماوەدا كە من لە شاری سلێمانیدا چاوەڕێی دەرچونی ئەمری تدریسەكەم ئەكرد شێخ عثمانی كوڕی شێخ گەیشتەوە بیارە، لە گوێزانەوەی من زۆر پەرێشان بوبو، لەلایەنی خۆیەوە لەلایەنی شێخی بیارەوە مەلا طاهری خادمی مەرقەدیان نارد بۆ سلێمانی، نامەیان بۆ شێخ محمدی قازی، مەلا محمودی مفتی، حاجی فقێ محمدی شاڵی، بۆ خۆم نوسی بو كە بگەڕێمەوە بۆ بیارە، بەلاّم من لەبەر ئەوە شارەزای وەضعی بیارە بوم، ئەم زانی شێخ حواسی نەماوە، ئەگەر بشرۆمەوە هەر لە رۆژێكا مجبوری نقڵ ئەبم عوزرم هێناوە، بڕیارم دا كە نەگەڕێمەوە.

خودا شاهدی حاڵە من لە بیارەدا بە دڵێكی پاك بە إخلاصەوە خزمەتی ئەو مدرسە و مقامەم ئەكرد، چاوم لە دنیاوە نەبوە، دڵم ئەوەندە بەسرابوو بە بیارەوە، نەم ئەتوانی بۆ سەفەری عادەتیش ناچاری نەبێ بیارە بەجێ بێڵم، لەو ماوەدا كە لەو شوێنە پیرۆزا تدریس و خطابتم ئەكرد، چەن جار لە چەن لاوە داوای ئەوە ئەكرا لە من كە بیارە بەجێ بیڵم، من ئەبەدەن دڵم بڕوای نەئەدا بۆ خەزێنەی دنیا تەركی بیارە بكەم، ئەو مدرەسە و مقامە بەجێی بێڵم، تا بەناچاری مجبور بوم (وكان أمر الله قدراً مقدوراً)..[1].

وە هەروەكو من بە فراقی شێخی بیارە زویر بوم، شێخ لەمن زیاتر لە فراقی من متأثر بو، حەتا بیستم پاش ئەوە كە بەتەواوی زانی بەوە كە من لە بیارە دەرچوم گریابو، قەدرێ فرمێسكی بەچاوا داڕژاندبو، فەرموبو، تەنیا مەلا كریم مابو لەوانە كە من دڵم پێیان خۆش بو، وا ئەویشتان عاجز كرد، ئەویش دوركەوتەوە لێم.

[1] مودەرریس باسی چەند كەس و جهەتی دەنوسێ كە داوایان لێكردوە بچێتە ئەوێ و بیارە بەجێ بهێڵا و دنیایان زۆر خستۆتە پێش، وەلێ بەهیچ چەشنێ قبوڵی نەكردوە.

## شاد بونەوە بەدیداری شێخ[1]

پاش هاتنی سلێمانیم لەساڵی دواییدا بۆ مەسئەلەی دەفعی نزاعی مەلاکانی هەڵەبجە لەسەر تێکدانی حوجرەکانی مزگەوتی جامیعە، بە اقتراحی حسن فهمی بەگ لەگەڵ مەلا محمودی مفتی، مەلا ڕەحیمی پەرخیدا هاتین بۆ هەڵەبجە، لەپاش ئەوە کە تۆزێ تۆزی مەلال لەناوا دەرچو، شێخ عثمانی کوڕی شێخ کە لە بیارەوە هاتبو بۆ هەڵەبجە حاضری ئەو مەجلسە بو، وتبووی بە حسن بگ کە بەمن بڵێت بڕۆین بۆ بیارە بۆ زیارەتی شێخ، حسن بگ وتی پێم، منیش قبوڵم کرد، لە خزمەتی مەلا محمودی مفتی، گەلێ لە مەلاکان ڕۆیشتین بۆ بیارە، کاتێ بەخزمەتی شێخ گەیشتین وەك گوڵ گەشایەوە، ئەو ماوە کە لە خزمەتیا بوین زۆر دڵشاد مسرور بو، کاتێ خوا حافظیمان کرد، فەرموی: بەو شەرعە إجازەت ئەدەم پاش ماوەیێ تر بێیتەوە، چەند رۆژێ لەلام دانیشی بۆ ئەوە کە تاسەم بشکێ لە چاوپێکەوتنت، مەبەسم ئەمەیە لەم فراقا نە من لەشێخ عاجز بوم، نە شێخ لە من عاجز بوە، بەڵکو شتێ بوو لەسەر قەزاوقەدەر –سبحان من لا مردّ لقضائه–.

دڵا بەشەوقی یاران بیمار بێ
نابی لە زەوقی ژاران بێزار بێ
ئیمانی نی یە ئەو بێ پەیمانە
لە ئازاری دۆست دەم بە هاوار بێ
دڵ نێچیرێکە بەتاو ڕائەکا
بەرەو ڕوی صەیاد کاتێ زاماربێ
بول بول کە بەدڵ گیرۆدەی گوڵە
ئالودەی باخە گوڵ بێ یا خار بێ
یاخوا ئەو خامە دۆستی نەنوسێ
بەتیغی جەفا هەر گرفتار بێ
یاخوا ئەو نامەی دۆستی تیا نەبێ
بەدەستی مەینەت لەتار لەتار بێ
ئەو کامەی لەسەر کامی دۆست نەبێ
یاخوا لەسەر دڵ بەژاری مار بێ
ڕۆژی ڕەستاخێز باش دیاری ئەدا
ئەوەی کوژراوی دیداری یار بێ
ئەو شەرتەی کردم لەگەڵ دۆستانم
هەتا قیامەت با بەرقەرار بێ
مژدەم لەسەرای غەیبەوە بۆ هات
با نامی حەشری لەگەڵ دڵدار بێ

***

ئەی دڵ هەتا تۆ بە جۆشی و تاوی
لە کورەی عەشقا بۆخۆت سوتاوێ
بزانە بە حەق خەلیلی خودای

[1] سەرباسی ئامادەکارە.

قەت خەیاڵ نەکەی بە دڵ فەوتاوی
ئەی بولبول هەتا دێوانەی گوڵی
مێملی باغ و چەم و شەتاوی
مەستی سەرچڵ و پەڕەی گوڵ
باغی بمری بزانە تا ئەبەد ماوی
نامی لە نەشەی عەشقی یارانا
إشارەی وەرگرت لە نیگای چاوی
ئازیز موژدەبێ قەبوڵ کراوی
لە سارای مەحشەر بەش نەخوراوی(ل207)

## نامی لە شاری سلێمانی دا[1]

هەروەکو قاضی شێخ محمدی حاڵ زۆر یارمەتی دام هەتا دامەزرام جەنابی سید غفوری مدرس و إمامی مزگەوتی سید حسن یش زۆر یارمەتی دام، تا مردن ممنونی أخلاقی بەرزی ئەو زاتەم.

لە مانگی ئەیلول لە عەینی ساڵ دا رێکەوتی مانگی ذي الحجة لە ساڵی 1370ك–1951ز دا مەلا صالحی زارا إمامی سید صادق لە شارەزورا کە لەوەو پێش لە مدرسەی بیارەدا خوێندبوی، عەلاقەی دوستی لەگەڵ مانابو ناردم بۆ بیارە، بۆ گوێزانەوەی ماڵ و منداڵەکانم بۆ شاری سلێمانی، وفعلاً گوێزاندنیەوە بۆ شار، لە نزیکی مزگەوتی (حاجی أحان)دا خانوی شێخ قادر بەرزنجی م بەکرێ گرتبو، لەو خانوا دابەزین، قەرارمان گرت والحمدلله.

پاش دامەزرانی مدرەسەی (حاجی أحان) خەڵکی محەلەکە بەبێ إطلاعی من خۆیان بریاریان دابو نابێ طلبەی ئەم مزگەوتە وەکو جاران بژین، پێویستە سێ کەسێ لەئێمە هەریەکێ رۆژێ بە پیاوی خۆمانا نان و چێشت بنێرین بۆ مدرەسە، بالفعل ئەم تەرتیبەیان تطبیق کرد، لەماوەی دەوامی منا لەو مزگەوتە ئەم یاسا دامەزراو رەفتار پێکراو بو. ئەم تەرتیبە لەسەر ڕاوێژی پیاو مناسبی محەلەکە بو، وەکو حاجی شێخ عبدالرحمن، حاجی سعید، عثمان محمد نادر، محمد صالح بۆسکانی، محمد خانی خفاف، غەیری ئەمانەیش لەو کەسانە کە حاضري نوێژ و طاعەتی مزگەوت بون.

لە بیست و چوارەمی شەوالی (1317ك– 1952/5/18)[2] مەلا محمدی کوڕی عباس خەڵکی دێی (بۆیین) لە وولاتی بانە، کە وەختی خۆی لە بیارەدا لەلام خوێند بوی، هاتبوو بۆ سلێمانی بۆ لام بۆ خوێندن إجازەی وەرگرت، شەربەت خۆرییەکی باشی بۆ کرا، رۆیشتەوە بۆ ولاتی خۆی، وەکو بیستومە موفقە لەسەر خزمەتی علم و دین.

وە لە ئەوەڵی زستانی (ساڵی 1372ك–1953ز)[3]دا مامۆستا مەلا قادری صوّفی لەدێی (بانی خێلان) لەنوێژی مغربا مبتلای سکتە بو، پاش شەوو ڕۆژێ وەفاتی کرد–طاب ثراه وجعل الجنة مأواه–(ل/208) لە ئەوەڵی بەهاری ساڵی 1373ك–1954ز شێخی بیارە علاءالدین متوفی بو–طاب ثراه– بۆ تعزیە لە سلێمانی یەوە ڕۆیشتم بۆ بیارە، تقریباً حەفتەیەکم پێ چو.

وەختی خۆی لە بیارەدا لەساڵی 1353ك–1934ز کتێبی (خلاصة التبیان)م نوسی بو، لەم ساڵەدا لە سلێمانی پوختەم کرد نوسیمەوە. هەروا دەستم کرد بە نوسین تەواوکردنی کتێبی (المواهب الحمیدة في حل الفریدة) کە زو لە

---

[1] سەرباسی ئامادەکارە.

[2] شێخی مدرس نوسیویەتی (شەوانی ئەم ساڵە) من خۆم ئەم تاریخەم نوسیوە، چۆن لەپێشتر و باسی تازەکردنەوەی مزگەوتی حاجی احان دا هاتووەو من ئەم نوسیوەتەوە .

[3] ئەم ساڵە زیادەی ئامادەکارە.

بیارەدا دەستم پێ كردبو بە ناقصی مابووەوە، بە كوردی شەرحێكم لە تصریفی زنجانی كردبو ئەمەیشم پاك نوس كردەوە . كتێبی (باغچەی معرفت) كە زو بناغەم دانابو، لە ئەندازەی چوار پێنج جوزوا بە نثر و نظم تەواوم كرد.

بەم اشتغالانە لەگەڵ تدریسا ئەم ساڵە برایە سەر، كە ساڵ بو بە 1374ك-1954ز، شێخ لطیف امامی مزگەوتی (حاجی أحان) وەفاتی كرد، پاش ئەوە هەرچەند خەڵكی محلە داوایان كرد لێم كە داوای إمامەتەكە بكەم، بەڵام من لەلام عەیب بو زووبەزوو داوای بكەم، تەفرەم دا، لەم ماوا مەلاجمیل ناو كوڕی مەلا برایمی كفری نقل كرا بە ئیمامەت بۆ مزگەوتی (حاجی أحان).

جا لە زستانی ئەم ساڵا دەرگای گەلێ مصیبەت و مەینەت لەسەرم كرایەوە، ئەم زەحمەتە رۆژ بەڕۆژ زیادی كرد هەتا رەمەزان، لە نۆی ڕەمەزانا شەوێ لە خەوا چاوم كەوت بە سوار و پیادەیەك، پیادەكە پرسیاری كرد لە سوارەكە: مەلا كریم تاكەی لەم مەینەتا دەوام دەكا؟ ئەویش فەرموی: پاش سێ رۆژ رزگار ئەبێ، واقعاً لە 11/رمضانا لە شاری سلێمانییەوە كەوتمە رێ بۆ بغدا، مراجعەتی مدیریەتی أوقافی عامەم كرد، لەو رۆژا سید محمد شفیق العانی مدیری ئەوقافی عام بو. ناسراوی سابق لە بەینمانا هەبو، كە ملاقاتم كرد، حاڵی خۆمم بۆ بەیان كرد، زۆر متأثر بو، گەلێ دڵخۆشی دامەوە، لەم جارا سید أمجدی زەهاوی زۆر مساعدەی كردم، خۆی لەگەڵما هات بۆ لای مدیری ئەوقافی عام.

سید محمد شفیق وتی: لە هەر لایێ ئەتەوێ دانیشی ئێمە مانعمان نییە تۆ مەعاشەكەت دەوام ئەكا، لەو ماوەدا وتی: إمامەت و خطابەتی (زین العابدین) لە كەركوكا شاغرە، ئەتەوێ نقلت بكەم بۆ ئەوێ؟ منیش وتم: لە نفسی كەركوكایە؟ فەرموی: بەڵێ . تەمز ئەو مەبەستی لە نفسی كركوك لواكەیە، منیش وام زانی لە نفسی شارایە قبوڵم كرد، ئەمریان نوسی بۆم، گەڕامەوە بۆ كركوك، كە گەیشتمە كەركوك حاڵی بوم ئەو شوێنە لە دەشتایە، شوێنێكی مهجورە، مناسبی وەضعی من نییە، لەبەر ئەوە لە عەینی ڕۆژا گەڕامەوە بۆ بغدا، بۆ مغرب گەیشتمە بغدا، سبەینێ مراجعەم كرد، وەضعەكەم بۆ باس كرد، ئەویش معذەرەتی كرد، فەرموی: ئێستە ئەتوانی لە نەفسی شاری كەركوك دا دابنیشی، من ئەمری إداریت بدەمێ لە كەركوك دانیشی تا شوێنی باش هەڵكەوێ.

## مامۆستای مودەڕڕیس لە كەركوك دا[1]

جا لەسەر ئەم قەرارە (ل/209) هاتمەوە كەركوك، لەبەر ئەوە كە سابقە معارفەم لەگەڵ مرحوم حاجی شێخ جمیل طالەبانی دا بو، لە تكیەی طالبانی دانیشتم... لەو سەردەما عبداللطیف كبیسی مدیری منطقەی كركوك بو، خوا حەقە زۆر حورمەتی گرتم، رعایەتی ئەكردم بەم تەرتیبە كەمێ زەحمەتی دڵم سوك بو، خوا جەزای حاجی شێخ جمیل بداتەوە زۆر حورمەتی گرتم، فەقێیان بۆ ڕاگرتم، مشغوڵی تدریس بوم، كوڕەكانی حاجی شێخ جمیل: شێخ علی شێخ عبدالرحمان زۆر خزمەتیان ئەكردم.

شێخ عبدالرحمن وورده وورده لە جمع الجوامع تحفە دەرسی ئەخوێند، خۆیشم مەشغوڵ بوم بە تەواوكردنی كتێبی (صفوة اللآلي من مستصفى الغزالي) ئەوەم تەواو كرد.

لە محرمی 1375ك-1955ز دا ماڵەكەم لە سلێمانی یەوە نقل كرد بۆ كركوك، لە حەوشی شێخ عزالدین طالەبانی كە لەو رۆژا شێخ فاتحی شێخ جەلالی تیابو دوو هۆدەم بەكرێ گرت، دانیشتین تیایانا.

لەم ماوەدا سید محمد شفیق مدیری ئەوقافی عام سەفەری كەركوكی كرد، هات بۆ تكیە، زۆر دڵخۆشی دامەوە... خولاصە وەزعێ وا هاتە پێشەوە كە تەكیەی طالبانی وەكو مدرەسەی خۆمی پێ هات، بە ئاسایش مەشغوڵی تدریس تألیف ئەبوم، ولله الحمد.

[1] سەرباسی ئامادەكارە.

وە لە مانگی محرم لە ساڵی 1375ك–1955ز مەلا محمد ئەمینی گەورەدێی، مەلا خدری سیپیرویی مەنگوری كە فەقێی خۆم بوون لە شاری سلێمانی، هاتن بۆ كەركوك بۆ ئەوە ئیجازە وەربگرن، مەلا محمد ئەمین هەر لە مانگی محرمدا، مەلا خدر لە مانگی جمادی الاولی إجازەیان وەرگرت..

پاش ئەوە كە لەم سالاَ كتێبی (صفوة اللآلي)م تەواو كرد (مەولود نامە و میعراج نامە)یێكم نوسی، تەسلیمی محمد أمین عصری م كردن چاپیان بكات، ئەو چاپی نەكردون، بەڵام من خۆم نوسخەی باشی ئەو دوو كتێبەم لەلایە تا خودا فرصەت ئەدا بۆ چاپ یان –إنشاء الله[1].

پاش ئەوە تۆزێ چاوم كرایەوە لە كەركوكا بەهۆی رەفاقەتی حاجی شێخ جمیلەوە بەهۆی ئەخلاق و ئینسانیەتی ماڵ و منداڵەكانیەوە خۆش ڕام ئەبوارد .

هەروەها علی رفیق افندی خادم السجادە، رأفت افندی برای، مەلا عبدالمجیدی قطب، حاجی مەلا عمری عمر گنبدی باقی مەلاكانی كركوك ئولفەت و محبەتی باشیان پەیدا كرد، بەتایبەتی لە سێ شەممە و جمعە دا خۆشمان ڕائەبوارد.

وە لە تكیە ڕۆژانی جمعە بەهۆی دەرویشانی تەكیەوە، أشعار خوێندنەوەی ئەوانەوە بەتایبەتی حاجی خالد اغای حسن قصاب مەلا محمدی بە شعری خۆش زۆر مەسروریان ئەكردم. (ل/210)..

وە لە هەموو شتێ خۆش تر لەسەر دڵی من ئەوە بو كاتێ لە تەكیەدا دامەزرام چەن جارێ لەخەوا بەخزمەتی حاجی شێخ عەلی أفندی طالبانی گەیشتم، بەم خەوانە گەلێ إنشراح ڕووی كردە دڵم...(ل/211)[2].

هەروا لە كركوك حمید أفندی بو انسانێكی زۆر ناسك، أدیب و لبیب محترم، ئارام بو، گەلێ جار ئەهات بۆ تكیە، لەقصرەكەدا دائەنیشت قسەی خۆشی زەمانی حاجی شێخ علی أفندی كەرامەت و كەمالاتی ئەو ذاتەی بَیان دەكرد، لەو باسانە دڵم زۆر مسرور ئەبوو.. هەروا باسی حركات و سكناتی شێخ رضای شاعری مەشهور برای حاجی شێخ علی أفندی ئەگێڕایەوە بۆم.. بە رەفاقەتی ئەم ذاتە باقی ڕەفیقان زۆر مەسرور ئەبوم.

وە بە ڕەفاقەتی حاجی صالحی مضمدی رباطی، كە وەختی خۆی سوختە بو لە بیارەدا لەبەر دەستی مەلا محمد زاهدی رباطیدا ئەیخوێند، لەپاشا ڕۆیشتبوە سلكی موظفینی مستشفی وە، زۆر مسرور ئەبوم.

پاش ڕابواردنی دو مانگ لەسەر دانیشتنی تكیەم، جارێ لەگەڵ شێخ حاجی كوڕی شێخدا ڕۆیشتین بۆ جەژن مبارەكی شێخ حبیب أفندی كوڕی حاجی شێخ علی، بەو ملاقاتە ئولفەت كەوتە بەینمان بە نەوعێكی وا، ئەبوا لە حەفتەیەكا ئەقەللەن دوجار چاومان بەیەك بكەوێ.

خانوەكەیان نزیك بو لە تكیە رۆژی سێ شەممەكان لە بەینی چاشت و نیوەڕۆدا دیدەنیم ئەكرد گەلێ حكایەتی قدیمی بۆ ئەكردم، ئەم ذاتە گەلێ خاوەن عەقڵ تێگەیشتو هوشیار ئاگادار بو لە أموراتی عالەم، زۆر لە اشعاری حافظ و سعدی لەبەر بو، توركی زان بو، ئەوزاعی عوائل و پیاوە گەورەكانی بغدا و كركوكی زۆر ئەزانی، لە أموری دنیا سەرامەد بو، زۆر واقعی بو، بە خزمەكانی ئەفەرمو: (ئازابن مەكەون، كە كەوتن گلەیی لەكەس مەكەن)...(ل/212)

قوربان ئوستادی پێغەمبەر خەصلەت
ئەم ئەشعارانەم وانارد بۆ خزمەت
گەرچی ئەشزانم یەكجار ناڕێكە
تۆ بیخوێنەوە فكرێكی لێ كە
بەڵا! بێ مەعنا و هەم بێ نكاتە
لەسەر تا پاین گشت تورەهاتە

1 هەردوك چاپ كراون لە دو توێی نامیلكەی (70) لاپەرەییدا و دواتر مدرس خۆی باسی دەكات.
2 لێرەدا مدرس سێ خەوت بەشێخ عەلی یەوە دەگێڕێتەوە بنواڕە ل/211–212.

رجات لیئەکەم ئەگەرچی واتە

تۆ بیخوێنەوە قربان بۆ گاڵتە

هەرچەند ئەزانم بێ ئەدەبی یە

چشتی وا ناردن هیچ معنای نی یە

تۆ لیّم ببورەو پێت گران نەوێ

ئینسان کە پیر بو خرفش ئەوێ

ئیتر هەر خۆش بی دائیم شادمان

بۆ طالەبانی و علم و طالبان[1]

منیش لە وەڵاما ئەم هۆنراوانەم بۆ نارد :

سەرداری شێخان بولەند درەجات

پەروانەی چرای ڕزگاری و نەجات

رشتەی هۆنراوەی پڕ جەواهرات

بەواتەی ناسك بەشێوەی بەرات

گەیشتە دەستی دۆستی بە وەفات..[2]

وە زۆر جار لەگەڵ علی ئەفەندی خادم السجادە دا دیدەنی شێخ حبیب مان ئەکرد وەبەینی چاشت و نیوەڕۆمان ڕائەبوارد.

وە زۆر جار علی ئەفەندی ئەهاتە تەکیە لە قەصرەکەدا بەقسەی خۆش ئەشعار (ئەدیبەکان) ڕامان ئەبوارد.

وە گەلێ جار پاش عەصران یا لەگەڵ شێخ علی دا، یالەگەڵ حاجی سعیدی محمد گوڵی بەر تکیەیی، یا بە تەنیا خۆم ئەڕۆیشتم بۆ ماڵی علی ئەفەندی، لە ناو حەوشەکەدا لەدەوری فوارەی چیمەنەکەدا، یا لەسەربانی دراوسێ حوجرەی سەجادەی شریفە دائەنیشتین، بە قسەی خۆش ڕامان ئەبوارد.

زۆر جار هەڵئەکەوت کە مەلا عبد المجیدی قطب کوڕی مەلا مەردان کوڕی مەلا محمد ی قطب کە باش مەلای کەرکوك، وەخزمی ماڵی علی رفیق ئەفەندیە لەگەڵ مەلا عبد الرحمن کوڕی مەرحوم مەلا علی حکمت ئەفەندییا، وەبعچی لە عالمانی ترلەویا حاچر ئەبون، بە أشعار نوکات ڕامان ئەبوارد، بە تایبەتی لە ڕۆژانی سێ شەم سبەینیان لە مزگەوتی حاج خلیل کە شوێنی مەلا عبد المجیدی قطب بو، لە پاش عەصران لە مزگەوتی ملا أحمدی مەلا حکیم(ل/215) مەلاکان دۆستانیان گرد ئەبونەوە، وەزۆر بە خۆشی ئەو وەختە ڕائەبورا لەسەرمان بەخصوصی لە بەینی من و مەلا عبد المجیدی قطب دا گەلێ نوسراوی محبت ودۆستی واقع بووە.

لەساڵی 1376ك–1956ز دا کتێبی (نورو نەجات) لەسەر نەزمی قصیدەی بوردیە بە کوردی نوسیم، چاپم کرد، کتێبی (نور الصباح)یشم لە مدحی حضرەت و یاران کە زو نوسی بوم چاپم کرد، هەر لەم ساڵ مەلا ڕەشیدی قولی جانی إجازەی وەرگرت، هەر لەم ساڵ دەستم کرد بە شرحی عقیدەی عەرەبی مەولەوی کە دو هەزار و سی و یەك شعرە، ناوی الفضیلة یە، ئەم شەرحە بەناوی (الوسیلة لنیل الفضیلة) لە ماوەی دو ساڵ تەواوم کرد.

وە لە ساڵی 1377ك–1957ز هۆنراوەیەکی کوردی بەشێوەی دوخشتەکی بە عنوانی (گوڵزاری حکمت) رسالەیێکی تر بەشێوەی نظمی فارسی رباعیات نوسیم، بەڵام ئەمانە هیچیان چاپ نەکراون، هەر لەم ساڵ مەلا حسین محمدی کۆیی، مەلا عمر ڕەشیدی هەورامی نۆدەریاوی، مەلا مصطفی ی کۆزەپانکی إجازەیان وەرگرت، لەم ساڵ دەستم کرد بە نوسینی

[1] ئەم شعرانە کۆپلەی کۆتایی شعرێکە لەسەر پیری و شێخ حبیبی کوڕی شێخ علی بەخەتی خۆی نوسیویەتی بۆ ئەوەی نامی سەیرێکی بکات، ئەم نامە ل/213.

[2] بۆ ئەم هۆنراوەش کە وەڵامی نامەکەی شێخ حبیبە، بنواڕە ل 214–215.

تعلیقات لەسەر (دیوانی مەولەوی)، تەواوم کرد، دەستم کرد بە نوسینی کتێبی (شەریعەتی ئیسلام) لە مذهەبی إمامی شافعی دا رضي الله عنه بەکوردی، هەر سالآ ربعێکیم تەواو کرد تا چوار سالْ تەواو بو. (ل/216).

...کاتێ کە کتێبی (بارانی رەحمەت)م لە کەرکوکا لەچاپ دا نسخەیێکم نارد بۆ مەلا عبدالمجیدی قطب، ئەویش لە تقریظ سوپاسی دیاری یە دۆستانەکەدا ئەم شعرانەی نوسی بۆم:

مدحی پێ ناوێ ذاتێکی وەك تۆ

تألیفەکانت شاهدن بۆ تۆ

ئەوە دەلیلە کە مەلای چاکی

شاسوارێکی چست و چالاکی

(أشهد بالله) پێت ئەڵێم مەلای

لە ئیشی بێ جێ بەخوا تَۆلای

هەرچی چاکەیە هەموت تێدایە

مەلا وارثی ڕێ ی أنبیایە

با کۆتای بێنین ئەم قسە و باسە

ڕێی بەتالْ لارەو ڕێگەی حەق ڕاسە

دو شاهد دەرچو حقیقت راس گۆ

بەشارەتیان دا بە من و بە تۆ

تاریخی تألیف بێ گرێ و زەحمەت

ڕژا بسردا باران رحمت[1]

لەو ماوەدا کە لەشاری کەرکوك دابوم لە زستانانا جارجار شێخ عبدالکریم کوڕی شێخ قادر کوڕی مرحوم شێخ کریم ی کەس نەزان، کە لە ساداتی بەرزنجەییە، لە نەتەوە مرحوم شێخ اسماعیل ی قطبی وولیانین، ئەهاتە ناو تکیەی خۆی لە محلەی قەڵادا، منیش جارجار ئەڕۆیشتم بۆ دیدەنی، بەهۆی مهرەبانی و نەجابەتی خۆیەوە ئولفەت محبەت لەناومانا پەیدا بو.. (ل/220)

لەو ماوەدا کە لە تکیەی طالەبانیدا (بوم)[2] لەگەڵ گەلێ لە منسوبینی ئەو شوێنا ناسراویم پەیدا بو، یەکێ لەوانە میرزا عبدالله ی مُدَبّر بو کە لە أصلا خەڵکی شاری سنە بوو، لەم أخرا لەشاری کرماشانا لە دائرەی بەریدا موظف بو، ئەم ذاتە إنسانێکی ناسك و أدیب و لبیب بو... (ل/221)

وە پاش ئەوە کە لە سلێمانیەوە ڕۆیشتم بۆ کرکوك، لە تکیەی طالەبانی بە عنوانی مدرس دانیشتم کەوتمە سەر فکری ئەوە دوبارە أشعارەکانی مەولەوی گرد بکەمەوە. بەقەی عەقڵی خۆم مانای شیعرەکانی بنوسم، جا بۆ إستفادە لە معلوماتی جنابی سید طاهر هاشمی کوڕی سید قیدر مشهور بە (سید الدولە)ی دەوڵەت ئاوایی نوسیم بۆ لای، ئەگەر مجموعە شعرەکانی خۆم لەلای ماوە إعادەیان بکاتەوە بۆم، غەیری ئەوانەیش هەرچەند ڕێکەوێ لە اشعار معلومات دەربارەی مەولەوی بنوسێ بۆم.

ئەویش لە جەوابا نوسی بوی بۆم، کە ئەو کجموعەی منە کەوتوەتە دەستی شێخ عزیزی خەڵکی دێی (علی بەکان) لە گەرمیان، قابل نی یە وەری بگرێتەوە، بەلآم مجموعەیێ لە (دیوانی مەولەوی) کە بە خطی خۆی نوسی بوەوە، زۆر مربوط

[1] ئەمە کۆپلەی ئەخیری شیعرەکەی مەلای قطبەو لەنێو دێری ئەخیردا بەشێوە نوسینی ئەبجەدی دەکاتە 1379ك، ئەمەش مدرس روونی کردوەتەوە، بنواڕە ل/217–219.

[2] ووشەی (بوم) زیادکراوی ئامادەکارە.

جوان بو ناردی بۆم، بێجگە لەمانە هەم معلوماتێکی مناسب دەربارەی مەولەوی معاصرینی مەولەوی ئەو نامانە کە نوسیویەتی بۆ بعضێ پیاوی گەورە، لە چەند جوزئێ کا بە خطی خۆی نوسی بووی،بەڕاستی ئەوەندە زەحمەتی کێشابو کە بەدڵ ممنون محجوبی کردم.

هەروا صورەتی ئەو نامە بێ نوختە کە مەولەوی نوسیویەتی بۆ (محمد پاشا)ی جاف، ئەویش بە خطی خۆی نوسیبوەوە ناردبوی بۆم.. هەروا تقریبا پێنج سەد شعرێ لە أشعاری شاعری بەسۆز مەلا مصطفیی بێسارانی بە خطی خۆی نوسی بوەوە، ناردبوی بۆم. جا بەرامبەر بەم کردەوە پیاوانەیە سوپاسێکی بێ ئەندازە و تشکراتێکی فوق العادەی تقدیم ئەکەم..[1] (ل/225)

لەمەوپێش نوسیم کە وظیفەی إمامەت و خطابەتەکەی کەرکوکم مربوطی مزگەوتی إمام (زین العابدین) بو، بە خصوصیەت لەلایەنی مدیریەتی أوقافی عامەوە تنسیب کرام بۆ تدریس لە تکیەی طالەبانی لە شاری کەرکوك، لەبەر ئەوە ئەو مزگەوتە مناسبی تدریس إیفای خدماتی دینیە نەبو، هەر لەسەر ئەم وەزعە دەوامم کرد هەتا ساڵی 1380ك–1960ز، لەم تاریخەوە ئەو وەزعە پێشوە گۆڕا، لە بەینی وەخت و وەختا داوای مباشرەی إمامەت و خطابەتی مزگەوتی (زین العابدین)م لێئەکرا.

منیش بۆ چارەسەری هاتم لە بغدا لە مدیریەتی أوقافی عامە إجازەی دوو مانگم وەرگرت، خۆم حاضر کرد بۆ ئەوە کە شاغری لە شاری بغدا ڕێ کەوی یا بە نقڵ یا بە امتحان خۆم بگوێزمەوە بۆی، تا لە نۆزدەی نیسان إعلانی شغور و إمتحانی إمامەت و خطابەتی جامعی (حیدرخانە) لە بغدادا کرا، منیش عریضەم دا، داخڵی إمتحان بوم، نجاحم وەرگرت، بەڵام لەپاشا لەبەر ئەوە کە لەوکاتا وەکیلی إمام و خطیب (عایش رجب) ناو لەوێ بو، خەڵککە ئولفەتیان گرتبو پێیەوە لەسەر تصویبی هیئەتی مجلسی علمی، قاضی بغداد (عبدالحمید أطروشي) قەراریان دا کە من بە إمامەت و خطابەتی (جامع احمدی) دامەزرێم(ل/235).

## نامی لە شاری بغدادا[2]

خولاصە لەسەر مرسومی جمهوری لە رۆژی 1960/8/11ز ڕێکەوتی مانگی ربیع الاول لە ساڵی 1380ك دا لەسەر إمامەت و خطابەتی ئەم مزگەوتە دامەزرام، یەکەم خطبەی جمعەی ئەم مزگەوتەم بە مناسبەی وەلادەتی حضرەتەوە صلی الله علیه وسلم لەسەر ایەتی ((وما أرسلناك الا رحمة للعالمین)) بو.

وە لەو ماوەدا بوو کە مشغوڵی أموری إمامەت و خطابەتەکەم بوم، إعلانی شغوری تدریسی مدرسەی (عاتکە خاتون) لە بارەگای حضرەتی عبدالقادری گەیلانی داکرا، لەسەر إرشادی بعضێ لە دۆستان داخلی إمتحان بوم، ولله الحمد، زۆر باش بەناجح دەرچوم.

وە لە ڕۆژی 15/تشرین الاول/ 1960ز ڕێکەوتی مانگی جمادی الاولی لە ساڵی 1380ك[3] دا مرسوم جمهوری لەسەر تدریسەکەم دەرچوو، لەو تاریخەوە مباشرەم بە تدریس کرد لەو مدرەسە مبارەکەدا ولله الحمد والمنه والفضل العظیم.

جا پاش ئەوە لەم مدرەسە مبارەکەدا دامەزرام، لەو کاتا کمال الدین عبدالمحسن الطائی مدرسی مدرسەی قادریە بو لە نەفسی بارەگادا، ئەم ذاتە بە إنسانیەت احترام هات بۆ چاوپێکەوتن، ترحیبی کرد بە دامەزرانم، قەرارمان دا بە تعاون بەبێ

---

[1] سید طاهر هاشمی هونەرمەندی جوان نوس، نامە گۆڕینەوەیەکی زۆر لەنێوان ئەو مدرسدا هەست پێ دەکەی و چەندەها نامەی سید طاهر هاشمی لەم دەستنوسەدا هاوپێچ کراوە، بۆ وێنە بنواڕە ل/223 و 226 و 229 و 233.

[2] سەرباسی ئامادەکارە.

[3] ئەم دو تاریخەی دوایی جەنابی مرحومی مدرس بۆخۆی ساڵە کۆچی و زاینیەکەی دیاری کردوە.

فەرق دەرسی طلبەكان بڵێین، ولله الحمد لەسەر ئەم منهجە بە خۆشی تا ئێستە دەوامەمان كردوە[1].

پاش دامەزرانم نامەیێكم بۆ هات لەلایەنی جەنابی سلالە الانجاب سید طاهر هاشمی دەوڵەت ئاواوە، تەبریكی دامەزرانی كردوم لەو نامەدا..[2]

لەماوەی هاتنی بغدا مشغوڵ بونم بە دامەزران لەسەر إمامەت و خطابەت و تدریس، لەلایەنی عُلما گەورەكانی بغداوە، وەكو شێخ امجد أفندی الزهاوی، حاجی نجم الدینی واعظ، سید فؤاد ئالوسییەوە یارمەتی تقدیرم وەرگرت، حەتتا سەید فؤاد كە یەكێ بو لە هیئەتی امتحان فەرموبوی: والله عەیبە ئێمە ئەم ذاتە إمتحان بكەین، ئەو جەوابانە ئە نوسیویەتی بۆ ئەسئلەی إمتحانی تدریس لایقی ئەوەن نوسخەیان بگیرێتەوە، إستفادەیان لێ بكرێ.

وە شێخ أمجد لە مجلسێكا فەرموبوی ((إنه من أفاضل علماء العراق)).

وە سید محمد شفیق العانی ئەوەندە تاریفی كردبوم لەلای جنابی سید برهان الدین الگیلانی،

وە سید عبدالله الگیلانی كە چاوم كەوت پێیان، سید برهان فەرموی: ((حقیقة ان الشمال قد أنجبت علماء افاضل لاسیما قد أطری السید محمد شفیق في الثناء علیك)) (ل/240).

وە بەتایبەتی حاجی عبدالقادر خطیبی إمام أعظم رضي الله عنه كە لە قدیمەوە دۆستی لە بەینمانا بوە زۆر احترام إنسانیەتی نیشان داوە، گەلێ جار دیدەنی كردوم.

ئیتر فضیلەتی سید عبدالحمید ئەترۆشی قاضی بغداد، سید علاء الدین سجادی إمامی مزگەوتی (نعیمە خاتون)، برای خۆم فضیلەتی مەلا عمر مولودی دزەیی إمامی جامعی سلیمانیە و خطیبی جامعی (علی أفندی) ئەمانە وەكو برای دایك و باوكی لەگەڵما معاملەیان كردوە.

لە زستانی ئەم ساڵا بەرگی چوارەمی كتێبە شەرعە كوردییەكەم بەناوی (شەریعەتی ئیسلام)ەوە تەواو كرد، لەپاش ئەو مجموعە الخطب بەزمانی عەرەبی كوردی نوسیم، بەڵام تەواوكردنی ئەم مجموعە كەوتە ساڵی 1381ك-1961ز.ەوە .

لە ڕۆژی یەك شەممەی مانگی نۆی 1960ی میلادی مصادفی مانگی ربیع الثاني لەساڵی 1380ی هجری دا ماڵەكەم لە كركوكەوە گوێزایەوە بۆ شاری بغدا، لە محلەی (جدید حسن پاشا) لە نزیكی شارع الرشید خانومان گرت، لەپاش مانگێ لەو شوێن گوێزامانەوە بۆ محلەی (مربعە) لە نزیكی (جامعی سید سلطان علی)دا، ماوەی دەمانگ لەوێ ماینەوە، جا گوێزامانەوە بۆ خانوێك لە پشتی بارەگای حضرەتی عبدالقادری گەیلانیەوە، لەپاش شەش مانگ مراجعەی دائرەی اسكانم كرد، لە (مدینة الثورة) خانوێكیان پێدایین، لەو خانوانە كە حكومەت دروستی كردون بۆ مستخدمین و موظفین.. تاریخی گوێزانەوەمان لە مانگی رجب لەساڵی 1381ك ڕێكەوتی 29/كانونی ئەوەڵی/ 1961ز. بوو[3] تا ئێستا تیایانا دانیشتوین. ڕجامە بە ساغ و سەلامەتی دەوام بكەین لەگەڵ مسڵمانانا لەسەر خزمەتی علم و دین موفق بین.

پاش هاتنی بغدا لە ساڵی 1381ك. دا بە مساعدەی دائرە المعارف (دیوانی مەولەوی)م لەگەڵ تعلیقەكانی خۆما چاپ كرد، بڵاوم كردنەوە، دو نسخەم لەو دیوانە نارد بۆ جنابان سید طاهر هاشمی مەلاعبدالمجیدی مدرس، ئەویش لە جەوابی نامەی ناردنی دیوانەكەدا ئەم نامەیە بۆ نوسیوم كە لەوبەری ئەم لاپەڕەوە ثبت كراوە بۆ یادگار[4].

پاش چاپی دیوانی مەولەوی كەوتمە پوختەكردنی كتێبی أدب كە بە عنوانی (العقد الذهب في جید الأدب) زو دەستم پێ كردبو ئەم كتێبە بریتیە لە (بدیع وعروض وحكم وأمثال) كتێبێكی جووانە ئومێدم وایە موفق ببم بۆ چاپكردنیان -انشاء الله تعالی-.

---

[1] كاتی نوسینی ئەم كتێبەی مەبەستە كە ساڵی شەستەكانە.

[2] بۆ ئەم نامەیە بنواڕە ل/236-238 نامەكە دەكەوێتە پێش نوسراوەكە.

[3] ئەم تاریخەش مدرس خۆی دیاری كردوە، من تەنها لە نوسینەوە كردومە بە ژمارە .

[4] بۆ ئەم نامە بنواڕە ل/242-243 لە دەستنوسەكەدا.

جا دەستم کرد بە تدوینێکی دوبارەی ئەو فەتاوای فقهیەی علمای کردستانە کە پانزەساڵ لەمەوپێش گردم کردونەتەوە بە ترتیبی أبوابی فقهی شافعی لە چوار جلْدا تەواوم کردون.. لە خودام ئەوێ بە لطفی خۆی یارمەتیم بدا بۆ چاپکردنیان تا مسلْمانان ئیستفادەیان لێ بکەن (ل/241)[1].

پاش ئەوە کە لە مدرسەی (عاتکە خاتون)دا.. دامەزرام، مەشغوڵی تدریس بوم، إعادەی نظرم کردەوە بەسەر رسالە منطقەکانما بەشێوەیەکی پوختە (مفتاح) (ورقات) (عزیزە) (وجیهە)م نوسیەوە، کەوتە بەردەستی طلبەکان، دو طالبی (مەلایەوی) ابراهیم بنیامین[2] دەستیان کرد بە خوێندنی ئەم رسالانە، تا ئێستە (مفتاح) (ورقات) یان خوێندوە، رسالەیە (مقولات)ێکی لەباسی مقولاتی عشرە و هەنێ إصطلاحاتی حکمەتیا تألیفم کردوە خوێندویانە، ئێستە مشغوڵی (عزیزە)ن، ئومێدم وایە بە میهرەبانی خودا کە باقی تالیفەکانیشم بە ووردی بخوێنن انشاء الله تعالی.

هەروا رسالەیێکی صەرف بە عنوانی (الصرف الواضح)م نوسی بۆ مبتدیەکان، گەلێکیان خوێندویانە.

وە لەساڵی 1380ك–1960ز لەپێش هاتنی بغدادا رسالەیێکی لغەتی عەرەبی کوردیم بەناوی (دوڕشتە) یا زمانی (دوبرا) نوسی بوم، کە هاتمە بغدا لەساڵی 1382ك–1962ز پاك نوسم کرد بە پوختەیی نوسیمەوە.

لەو کاتا لەشاری سلێمانیدا بوم، گەلێ فەقێی وولاتی خۆمان بە ڕەسمی لەسەر یارمەتی حکومەت ڕۆیشتن بۆ جامع الازهر) بۆ ئەوە لەوێ دەوام بکەن، تا شهادە وەرئەگرن، جا بگەڕێنەوە بۆ ولات بە مدرس لە ثانویە رەسمیەکانا دەرس بلێنەوە، ئەم کۆمەڵە طلبە هەمو لە دۆست و ئاشنابون جارجار بە مناسبە نامە لەلایەنی ئەوانەوە بۆ من، لەلایەن منەوە بۆ ئەوان ئەنێررا، لەناو ئەم کۆمەڵەدا دوانیان زۆر عەلاقەیان بە منەوە بو، یەکەم: عبدالکریم ڕەمەزان خەڵکی دێی گوڵپ لەلای بیارە، دوهەم: فاضل عبدالواحد خەڵکی شاری سلێمانی، لەساڵی 1382ك–1962ز. دا لە وەلامی نامەیێکی عبدالکریم ڕەمەزان، کە نوسیبوی خەیالْم هەیە لەم بەینا بێمەوە، منیش لە جوابی ئەم نامەدا چەن شیعرێکی پڕلە سۆز و محبەتم بۆ نوسین(ل/244):

ئەی نوری چاوی باب و دڵی دایەنی وولات
ژیرن شوکر هەمو نیە حاجەت لە بۆ بەیا ن
ئەو ڕۆڵە رولە مەردیە بەری زانستی بێتە دەست
ئەو کەللە و تاج دارە بزان بێ لە ڕوی زەمان
ژینت بەهێزو نەیروە نەیرۆ بە علم و فن
علمت بەکار و کۆششە کۆشش بە ڕۆح و گیا ن
نامی کەسێکی وایە بنوسێ بەدەستی هێز
ناونیشانی مەردی لەبەردی کتێبەکان
نامەردە ئەو کەسە بە طُفیلي وەکو منالْ
هەڵ سوڕێ دەم بەدەم لە بەرو دەوری خەڵکەکان
نامی کەسێکی وایە بە تەوفیقی ذاتی حەق
پرتە و بداتەوە بە هەمو قوژبن و مەکان

[1] ئەم دوعایانەی مامۆستای مودەرریس گیرا بون و زۆرینەی ئەو کتێبانە چاپکراون.

[2] لای هەموان ئاشکرایە کە قوتابیەکەی زۆری مامۆستای مدرس هی دەرەوەی ولاتن و هەندێکیشیان غەیرە عارەبن، زۆر هەولم دا کە بەهۆی دیمانەکانمەوە لەگەڵ مامۆستایاندا هێندێکیان ناو بنوسم و کورتە ژیانیش بۆ دیارەکانیان بنوسم، وەلێ ئەفسوس لەوەی مامۆستای مدرس نوسیویەتی زێترم دەست نەکەوت کە ناوی ئەم دو قوتابی یەیە، (بنیامین) قوتابیەکی زۆر دیارە و هەریەك لە مامۆستا محمد علی قەرەداغی و د. محمد گەزنەیی و مامۆستا یاسین دەرویش بۆیان دوپات کردمەوە. (ابراهیم)یش هەر قوتابی یەکی دیارە و مامۆستا محمد علی قەرەداغی گەورە نوسەر بۆی دوپات کردمەوە.

نامی کەسێکی وایە بەئاوی تەلای عەمەل
دانی خەتی ئەمەل لە پەڕەی سنگی رۆلەکان
هیوام وەهایە وەربگرن پەندی پڕ لەسود
هەتا ببن بە داری بەری بەرزی میوەکان.[1]

لەپاش ماوەی دوساڵ و چەند مانگێ لەلایەنی وەزارەتی إسکانەوە، ئەمر هاتە سەر ئێمە و دراوسێکان، کە لە تاریخی 1964/6/6ز.دا حازر بین بۆ ئەوە کە عقدی تملکی خانوەکانمان وەربگرین، لە دائرەی کاتبی عدلی جنوبی بغدا عقدەکە تەواو بکەین، بالفعل لە عەینی تاریخا لە دائرەی اسکان حاضر بوین، ئەمریان پێداین بۆ لای کاتبی عدلی جنوبی بغدا یانی محکمەی شرعیەی سنی جنوبی، لەویا عەقدی تملکی خانوەکان لە مقابلی نۆسەد و شەست و سێ دینار بە أقساط بۆ ماوەی بیست و پێنج ساڵ تەواو کرا، ورقەی تملکمان وەرگرت، وعلى الله التوكل في السكون بها موفقين وبه الإستعانة. انه خير من يتكل عليه ويستعان.

لە مانگی ذی الحجةی تاریخی 1383ك-1964ز.دا متولی ئەوقافی قادرین السید یوسف الگیلانی کتابێکی نوسی بۆ ئەوقافی منطقەی بغداد، إقتراحی کرد کە من تعیین بکەن بە إمام بۆ نوێژی نیوەڕۆ و عصر لە جامعی حضرەتی عبدالقادر گیلانی، ئەوانیش لەسەر ئەو نامەیە تأییدیان نوسی بۆ وەزارەتی ئەوقاف، لەسەر إمامەتەکەم موافقە کرا، لە رۆژی 4/ حوزەیران 1964ز مجلسی وزراء تصدیقیان کرد، لە تأریخی 24/حوزەیران لە ساڵی ناوبراوا مصادفی 16/صفر الخیر/ 1384ك.دا امری ئەوقاف کە نێررابو بۆ لای متولی السید یوسف الگیلانی لەسەر امامەتەکەم تبلیغ کرا پێم. (ل/246)

وە لە 8/شوباطی/1969 میلادی دا موافقی 1388ك موافقی رۆژی شەممە 21/ذي القعدة. خودای أرحم الراحمین لطفي فەرموو توفیقی دام رۆیشتم بۆ بەجێ هێنانی واجبی حج، لە رێگەی بصرە و کویت و ریاضەوە گەیشتم بە مدینەی منورە (علی صاحبها الصلاة والسلام)، هەشت رۆژێ لەوێ مامەوە، دوو جمعەم تیاکرد، جا ڕێکەوتن بۆ شاری مکەی مکرمە، لە شەوی یەك شەنبە گەیشتم بە مەککە لە عەینی شەوا طەوافی عُمرەمان لەگەڵ سعی بینی صفا و مروە بەجێ هێنا لەپاش أدای حج لەرێگەی ریاضەوە گەڕامەوە بۆ بغدا، لە رۆژی جمعەدا سبەینێ مصادفی 18/ذي الحجة 25 شباط گەیشتمەوە بغدا، والحمدلله علی ذلك كثيراً طيبا مباركا فيه، وصلى الله على سيدنا محمد وعلى آله وصحبه وسلم تسليما.

لەپاش سەفەری حەجی پیرۆز، زیارەتی حضرەتی فخری عالەم صلی الله علیه وسلم موفق بوم رسالەی مولودنامەو میعراج نامە چاپکرد، نسخەییێکم بەدیاری نارد بۆ جنابی مەلا عبدالله ی کوڕی مرحوم مەلا صاڵحی چەمەکی ئەم مەلا عبدالله دەمێکە دۆست و برادەرمە.. ئەویش قصیدەیێکی نوسی بو بۆم، وا قصیدەکەم لە عینی وەرەقی خۆیا ثبت کرد بۆ یادگار:

سڵاوی بەرزی ماموستای بەڕێز
بەڕێز ئەنێرم ڕێز لەشوێنی ڕێز
هانام لەو خوا کە بێ هامتایە
ژین تانە هەتا هەتایە
سی بەری سەران بژین بەخۆشی
دوربن لە دەرد و وەی و نەخۆشی
چاوەی زانین و دەریای ئایین
کانگای بیرو هۆش، شارەزا لەدین

[1] کۆتا کۆپلەی ئەو شعرەیە کە نامی ناردیوتی بۆ قوتابیانی کورد لە میصرو هانیان دەدا کە نەگەڕێنەوە خەریکی کۆکردنەوەی زانست بن بۆ بەرەو پێش بردنی ولاتیان. بنواڕە بۆ ئەم نامە ل/244-246.

بە دەرهێنەری کالاّی بەقیمەت
لە دەریاری بێ بن دین و شەریعەت
خوا بت هێڵی براپشتی حەق
بۆ ڕەواجی دین دەمکوتی ئەحمەق
پیاوە گەورەکان وەك عمر عزیز
وەختێ ڕۆیشتن لە ئێمە بون زیز
بەرزی ئەوانم لەتۆدا ئەدی
گەر ئەتۆ بڕۆی چی بکەین ئەدی
هاوتایشت نی یە لایدەم خەم بەباد
دووربێ کە وون بوی دڵ بەکێ کەم شاد
لەبێ هامتایە داوای ژیانت
مردنی گەلە دوربێ نەمانت
ئەتۆ پاڵپشتی دیواری دینی
تۆ بوژێنەری شەرع ڕەنگینی
تۆی شیکەرەوەی گرێ و کۆسپی دین
شەرع و أحادیث قورئانی شیرین
ئەتۆی پێشەوای گەلی زانایان
ئەتۆ ڕەهنمای کۆمەڵی نەزان
تۆ چرا بەدەسی ڕێ ون بوانی
ڕی نیشان دەری پیر و جوانی
چراوکی شەوی تاریکەشەوی
گۆچانی دەستی بەرزی یا نەوی
أنت المحقق للشرع الساطع
أنت المجدد للماءة الرابع
تۆ پەنادەری پەنابەرانی
تۆ وەلاّم دەری گرێی قورئانی
یا کریم کریم کەرەم کەی پێمان
هەتتا ماوەیەك وون نەبێ لێمان
بۆ سپاسی تۆ زمانم کۆڵە
وەسفت چۆن بکەم بەم بۆڵەبۆڵە
دەمو قەوچێکی منی بێ هونەر
ناتوانێ چاکەت بخاتە دەفتەر
بێینە سەرباسی دیاری تەمیزت
بەسەرکردنەوەی بچوك عەزیزت
نوسراوی ڕەنگین مەولودنامە
هۆنراوەی تریش میعراج نامە

زیارەت کرا نامە سەرچاوم

وەی لەم خۆشی یە بەسەر کراوم

پاداشتی هەستی شیرین و جوانت

بەمن نادرێ بم بەقوربانت

نەوازشی تۆ هەر بۆ خودایە

بۆیە پاداشی هەر لەو تەمایە

بێ فەڕی وەك من جا چی لەدەسدێ

خەوش و خاڵێکە بێ کەڵکو بێ جێ

(عەبە) بوەستە تۆ لە دەم زەنی

ئەتۆ غەواصی ئەم دەریایە نی[1]

لە الطافی خودای رؤف و رحیم داوا ئەکەم کە لەسەر خزمەتی دینی مبین لەم شوێنە پیرۆزا موفقم بکا، ببم بە وسیلەی سعادت بۆ خۆم و موسڵمانان. إنە سمیع قریب مجیب، وصلی الله علی سیدنا ومولانا محمد وعلی آلە وصحبە وسلم تسلیما الی یوم الدین وآخر دعوانا أن الحمد لله رب العالمین.[2]

[1] بنوارە ل/249 بۆ ئەم نامەیەی کە ئەم ئعرەی تێدایە.

[2] ئەمە کۆتایی ل/246 ە، لە شوێنی خۆی نەمنوسیوە و لە کۆتایی ئەم شعرە کە لە ل/249 دایە نوسیومەتەوە.

## کۆتا ژیانی مودەڕڕیس و کۆچی دوایی

خوێنەری عەزیز پاش ئەم گەشتە لەگەڵ پێنووسەکەی مودەڕڕیسداو پاش ساڵی 1969ز مامۆستا عەبدولکەریمی مودەڕڕیس لەسەر وانەوتنەوەو نووسین بەردەوام دەبێ.. قوتابیانی لە کوردەوە دەگوێزرێنەوە بۆ عارەبو ئەوانیش زۆر سوودی لێ دەبینن و ئێستە لە ئاستی عێراقدا سەدان پرۆفیسۆرو گەورە زاناو سیاسەتمەدار هەن کە قوتابیو شاگردو ئیجازە پێدراوی مودەڕڕیسن و بە ئێستەشەوە مامۆستایانی ئاینی عارەب شانازی بە مامۆستا کوردەکەیانەوە دەکەن و بچووکی مامۆستا دەکەن.

مامۆستا لە بەغدادا بووە مۆم بۆ هەموو ئەم وڵاتە خەڵکی لە سەرجەم شارەکانی عێراقەوە بۆ زیارەتی ڕوویان تێدەکردو زۆر بە پیرۆز سەیر دەکرا، من بۆ خۆم چەندین جار شێخی گەورەی عارەبو دەسەڵاتدارانم بینیوە هاتوونە خزمەتی و دەستو پێیان ماچ کردووەو داوای دوعای خەیریان لێ کردووە، کە مامۆستا نانی خواردووەو پاروە نانێکی لێ ماوەتەوە خەڵکی بۆ شیفاو پیرۆزی بە خۆشبەختییەوە دەیان خواردو بۆ نەخۆشەکانیان دەبرد.

لەم جێگە پیرۆزەدا مامۆستای مودەڕڕیس زۆر سوودی بە موسڵمانان گەیاندو گەلێ خزمەتیشی بە کورد کرد، بێ لەو هەموو نووسینە کوردییەی کە بە چاپی گەیاندووە، حوجرەکەی بوو بوویە خانەی بێنەوایانی کورد لە بەغداد.

"لەم جێگەوە مامۆستای مودەڕڕیس توانی سەدان قوتابی پێ بگەیەنێ و ببێتە مامۆستای کوردو عەرەبو تورك و مالیزی[1] و پاکساتی.

بەم وێنە لەسەر وانە وتنەوە بەردەوام بوو تا لە ساڵی (1973ز) خانەنشین کرا، وەلێ بنەماڵەی شێخ عەبدولقادری گەیلانی وەك ڕێز لێنانێك هێشتیانەوەو کردیانە پێشنوێژی نیوەڕۆ و عەسری مزگەوتەکەیان.

ئیتر ئەم پیرە لاوە لەسەر وانەبێژیو فەتوادانو نووسین و چاپکردن لەم حوجرەدا بوبووە هاوەڵی خامەی، بە قامکی شەشەمی دەستی ڕاستی حسێب دەکرا، بێوچان هەر دەینووسیو دەینووسی تا پیریو نەخۆشی سەریان بە قەڵەمەکەی نایەوە"[2].

لە ڕاستیدا من بۆ خۆم خوا کۆمەکی کردم کە دووجار چاوم بە مامۆستای موددەریس بکەوێتو دوو کورتە دیمانەی لەگەڵ سازبدەم، یەکەم لە بەرواری 2005/4/21، دووهەم لە 2005/6/28، ئەوەی تا ئەو کات لەسەر ژیانی مامۆستا بۆم دروست بوبوو، لێم پرسیوەو سوودم لێ بینیوەو لە ماستەرنامەکەمدا نەقڵم کردووە، ئەوەش کە تێبینم کرد لەم کۆتا ژیانەیدا چەند شتێك بووە کەپێم خۆشە لێرەدا بیاننووسم:

یەکەم: گیرابوونی دوعای مامۆستا کە بۆ خۆم چەند دوعایەکم داوا لێکردووەو هەموویان گیرابوون.

دووهەم: بە چونم بۆ خزمەتی مامۆستا هەستم بە گورجی قەڵەمەکەم کردووە کە پێشتر وەها نەبووم و بە بەرەکەتی ئەوی دەزانم.

سێهەم: هیمییەتی مامۆستا بۆ حوجرەو فەقێ و غەمی بەردەوامی بۆ نەمانی قوتابخانە ئاینییەکان کە بەردەوام هەواڵی دەپرسین.

چوارەم: کرانەوەی دڵی ئەو پیرە غەریبە بە بینینی مەلایەکی کوردو خۆشەویستی و دڵسۆزی نواندن بۆی.

---

[1] لە ڕێی دیمانە لەگەڵ هەریەك لە بەڕێزان (محمد علی قەرەداغی، یاسین دەروێش، صلاح الدین سەنگاوی، محمد ئەحمەد گەزنی، عەبدولقادر ڕەسول بەرحکی..) زۆر هەوڵم دا ناوی هەندێك لەو قوتابیانە بەدەست بێنم کە غەیری عارەبو کوردن و تەنها ئەم سێ ناوەم دەست کەوت:

یەکەم: بنیامین أبوبکر ملایوی.

دووەم: ئیبراهیم غانا، کە هەردووکیان مودەڕڕیس لەمەو پێش باسی کردن.

سێهەم: عەلی تورکی.

[2] ئەوەی نێوانی ئەم دوو کەوانەیە لە ڕۆژنامەی (کۆمەڵ) ژمارە 188 بلاوکرایەوە.

پێنجەم: ویستنی یەكێتی مەلایان‌و موسڵمانان‌و فڕێدانی تەفرەقەو خیلاف لە بەردەم دوژمنان‌و عەوامی خەڵكدا سیفەتێكی بنەڕەتی‌و هزری مامۆستابوون.

شەشەم: بیرتیژی ئەم پیرە پیاوە سەد ساڵە زۆر سەرسامی دەكردم، هەواڵ پرسینی هەندێ خەڵكو شوێنی هەورامان.. چۆن ئەمانەی بەم چاكییە لە بیر مابوو، خوا زیرەكییەكی بێ وێنەی دابوویە.

حەوتەم: لەگەڵ خەیربوون بەبی گوێدانە بیرو بۆچوونەكان، چەندجار لە مامۆستام بیستووە كە باسی مەشورعو دەزگایەكی خەیری كراوە یەكسەر فەرموویەتی (دەستی خەیرم لەگەل ئیشی خەیرتاندایە)، گوێی بەوە نەداوەئەمانە چ گروپ‌و بیرێكیان هەیە، گرنگ ئیشیان خەیر بێت‌و ئەمیش بەشداری خەیر بێت.

هەشتەم: مێژەرە بچووكگەكەی مامۆستا زۆر سەرنجی ڕاكێشاوم بۆ پاك ڕاگرتنی مێزەرەو نەفرۆشتنی بە سوڵتانەكانی دونیاو پیس نەكردنی بە ڕیاو مەرایی كردن لەبەردەمك سیاسییە درۆزنەكاندا.

نۆیەم: پشت بەستن بە خواو ئیش كردن بۆی زۆر گرێ كوێرەی ژیان دەكاتەوەو زۆر لەوانەی خەڵكی لێیان دەترسن لەبەر پێیدا دەكەون‌و هێزی دڵ كاردانەوەی لەسەریان دەبێت.

دەیەم: لەم دونیا خوا بە خزمەت‌و ماندوو بوون گەورەییت دەداتێ بنوارنە مامۆستای مودەڕڕیس خوا بە هۆی خزمەتی بێ وچانیەوە گەیاندیە كوێ، بەردەوامی لەسەر هەركاێك و سووربوون لەسەری بەرهەمی شیرینی دەبێ‌و بەرزی‌و گەورەیی پێ بەدەست دێت.

ئیتر شەو گەیشتە 2005/8/30\29 مامۆستای مودەڕڕیس بە یەكجاری ماڵئاوایی كردو وەك مۆم توایەوەو پرشنگی خۆر ئاسای دڵی سەدان، هەزاران، سەرگەردانی وەك منی خستە جۆش‌و ڕۆشنیكردەوە، پەنجەی شایەتی هەزارانی خستە گەڕ بۆ نووسین‌و شایەتیدان‌و شین گێڕی.

ئای ئەوە ئەو پیرەیە لە ژیاندا حورمەتی لەلایەن گەورە پیاوانی كوردەوە لێنەگیرا، تەنها لەبەر ئەوەی كوردە، گەورە پیاوانێك كەڕێ‌و جێگەیان بەغداد بوو بۆ تاكە جارێ بە ڕەوایان نەزانی تەقە لە حوجرەكەی ئەم پیرە دل پڕ لە غوربەتە بدەن‌و گوێ لە ئامۆژگاریی‌و فەلسەفەی ژیانی بگرن"[1].

ئای ئەوە ئەو نووسەرە گەورەیە لە دوای مردن كەس فرمێسكی بۆ ناڕژێ‌و عەلمانییەكانی سەردەم لەبەر مێژەرەی ڕووناكی حورمەتیان نەرگت‌و تازەشیان بۆ نەگێڕا.

پاشاو گەورەكانی ئێمە هەڵەش ناكەن، تا داوای لێبوردن لە ڕۆحی پاكی مامۆستا بكەن‌و بۆ مێژوو و دوا ڕۆژ بەرامبەر بەم شەرمەزارییەیان هەڵوێستێكیان هەبێت.

سڵاو لە گۆڕی ڕوناكت ئەی مامۆستا، میهرەبانی خوا بڕژێ بە سەرتدا، نوكی خامەت چرای نێو گۆڕت بێ، بە ئەندازەی پیتی نووسراوت لێبوردەیی خوا بباری بەسەرتدان خوایە نووسەرو خێۆنەرو یارمەتیدەری ئەم كتێبەو مامۆستای مودەڕڕیس‌و سەرجەم مامۆستیانی مێزەر پاك بە بەهەشتی بەرین شاد بكەو عالی مەقامی هەردووك دنیایان بكە.

## جوانترین وەفا

خوێنەری بەڕێز ئەمە ژیانی مامۆستا مەلا عەبدولكەریمی مودەڕڕیس بوو، كە قەڵەمە لەرزۆكەكەم بە شەرمەوە بۆ وەفاتی ئەوی نووسیوە، بە گریەوە بۆ نەمانی ئەوی نووسیوە.

لێرەدا دەمەوێ كۆمەڵە بابەتێك پێشنیاز كەم بۆ ئەوەی قوتابیانی ماستەرو دكتۆرا نامەكانیانی لەسەر بنووسن، وەك

[1] لە ڕۆژنامەی كۆمەڵ ژمارە (188) بڵاو كراوەتەوە.

هێمنی شاعیر دەیداتە دەست مامۆستایانو بۆ پسپۆڕانی بواری خۆی بەجیٚ دیلا [1].

هەروەها داوامە لە نووسەرانو لێکۆڵەرەوان ئاوڕێك لەم بابەتانەو هەزاران بابەتی تر لەسەر پەرتووكو ژیانو تاقیقی دەستنووسەکانی (نامی) بدەنەوە، ئەمەش گەورەترین پرسەو سەرەخۆشییە لەلایەكو جوانترین وەفاو ئاسودەییە بۆ دڵی زامداری زانایەکی گەورەی کورد وەك جەنابی مامۆستا عەبدولکەریمی مودەڕڕیس.

بابەتە پێشنیارکراوەکان:

1. الشيخ عبدالكريم المدرس وجهوده في علم الكلام.
2. الشيخ المدرس وجهوده الفقهيه.
3. الشيخ المدرس وجهوده اللغوية.
4. تحقيق (مواهب الرحمن في تفسير القران) ئەمە بە حەوت کەس ئەنجام دەدریٚ، چون حەوت بەرگە.
5. دراسة أدبية لأشحار (نامى) العربية والكردية والفارسية.
6. تحقيق (الصفوة اللآلي) ئەمەش بۆ چەند قوتابییەك. چەندەها بابەتی تر لەم چەشنە.
7. مامۆستای مودەڕڕیس بەرهەمو ژیانی.
8. لێکۆڵینەوەو پێداچوونەوەی تەفسیری نامی.
9. لێکۆڵینەوەیەکی ئەدەبی رەخنەیی لەسەر شیعرەکانی نامی.

لەکۆتاییدا دەپاڕێمەوە لەخوای پەروەردگار کە لەگوناهی مامۆستامان خۆشبێتو بە بەهەشتی بەرینی شادکاتو لەگەڵ هاوەڵانو پیاوچاکاندا لە سایەی سێبەری پێغەمبەری خۆشەویستمان ﷺ کۆکاتەوەو حەشر بکاتو لەویٚ بەدیداری مودەڕڕیس شاد بینو ئێمەش بەپێو قەدەمی ئەو چاکە بەچاك قەڵەم ڕەو کرێین، با هەموومان هێواش ئاسا بەرۆحی پاکی ئەو پاکە بڵێین:

یارەبی خوا لێت خۆش بێت

جێگات بەهەشتی خۆش بێت.

[1] پێشەکی هێمن بۆ چاپی دوەمی (نالی)

## ناوەڕۆك (ژمارەی لاپەڕەكان هی كتێبە چاپكراوەكەن)